دباغی، غفور، ۱۳۰۵ ـ ۱۳۶۸ .
دیوانی مه لاغه فـوور ده بباغـی: حافـزی مـه هـابـادی /ئـامـاده کـردن و لـه سه ر نووسیـن و پیدا چوونه و ریک خستنی فاروق صفی زاده بوره که یی .-- سقز: موحه ممه دی سه‌قز، ۱۳۷۹ .
۲۰۳
ISBN 964_6720_21_8
فهرستنویسی بر اساس اطلاعات فیپا.
کردی
۱.شعر کردی --قرن ۱۴. الـف. صفـی زاده، فاروق، ۱۳۶۴ - ب. عنوان.
۲ د ۴۴۳ ک / ۳۲۵۶ PIR ۹/۲۱ فا۸
۱۳۷۹
کتابخانهٔ ملی ایران ۱۱۷ـ۷۹م

**بڵاوکەرەوەی موحەمەدی سەقز**
**نێوی پەڕتووك : دیوانی حافزی مەهابادی**
**هۆنراوە: مامۆستا مەلا غەفوور دەبباغی**
**پێداچوونەوە و ئامادە کردن و لە سەر نووسینی: فارووق بۆرەکەیی «صفی‌زاده»**
**بڵاو کەرەوە: ئینتیشاراتی موحەممەدی سەقز**
**هەژمار: ۳۰۰۰ بەرگ**
**نۆبەتی چاپ: یەکەم**
**ساڵی چاپ: ۲۷۰۰ی کوردی کەونارا**
**شابەك: ۸ ـ ۲۱ ـ ۶۷۲۰ ـ ۹۶۴**
**چاپ و سەحافی:**
**سەقز: شەقامی ئیمام ـ بڵاوکەرەوەی موحەممەدی سەقز «ناوەندی بڵاوکەرەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی» دووروێژ (تەلیفۆن): ۲۳۵۹۴**

# پێرست

## پێشەکی

لەم راستی‌یەدا هیچ شك و گومانێك نییە و مێژوو سەلماندوویەتی کە کۆنترین خەت و نووسین و زبان و تەنانەت هۆنراوە و وێژە و زانستەکانی ئەورۆی جیهان کە ئەورووپی‌یەکان و رۆژئاواییەکان شانازی پێوە دەکەن، هی کوردە و گەلی کورد بەدی هێنەری خەت و زبان و شیعر و فەلسەفە و ئایین و هەموو زانستەکان بووە. بە داخەوە کاتێ مێژوو دەخوێنینەوە، هەمووی پڕیەتی لە درۆو دەلەسە و بە پێچەوانەوە هەموو شتێکیان داوەتە بەر تۆژینەوە. یۆنان و رۆمی کەونارا بۆتە بابی هەموو زانستەکان، لە حاڵێكدا یۆنان یەکێ لە ناوچەکانی ئێران بووە و هەرشتێکی هەبوو. هی کورد و ئێران بووە. دۆزرانەوەی خەتیان هی میسری‌یەکان زانیوە، لە حاڵێكدا کوردە هوری‌یەکان- کە ئەورۆبە درۆ پێ‌دەڵێن سوومەری، - خەتیان دروست کردووە. داهاتنی هۆنراوە و فەلسەفەش هەر بە هی یۆنیانیەکانیان زانیوە، لە حاڵێكدا کۆنترین شیعرو وێژە، هۆنراوە پیرۆزەکانی «گاتاکانی» حەزرەتی زەردەشتی کوردە«ص» کە چواردە هەزار ساڵ لەمەوبەر هۆنراوەتەوە و کێش و پاشیلکیش هەیە و کۆنترین ئایینیش ئایینی زەروان و مێهرە، کە هی کوردەکانە و کۆنترین ئایینی تاقانە پەرستیش ئایینی مەزدەیەسنای ئاشوو زەردەشتی کوردە. یەکەم شارستانیەت و یەکەم پاشایەتی هی کوردەکانە و یەکەم نەتەوە یەك کە کارەبای دۆزیەوە، لە پێنج هەزار ساڵ لەمەوبەردا، کوردەکان بوون و یەکەم نەتەوەیەك کە لە بژیشکی‌دا سەرکەوتووبوو و شەش هەزار ساڵ لەمەوبەر، یەکەم عەمەلیاتی مێشکیان ئەنجام داوە، کوردەکان بوون.

ئەورۆبەداخەوە هەندێ پان فارسیسم، تەنانەت زبانی پیرۆز و کەونارای کوردی بە زاراوەیەك لە زبانی فارسی!!! دەدەنە قەڵەم، لە حاڵێكدا زاراوەی فارسی، خۆی یەکێ لە زاراوەکانی زبانی کوردی‌یە و تەنانەت زاراوەی عەرەوی و هێندی سەنسکریت و پالەوی و ئازەری و پارسی کەونارا و زبانەکانی ئەورۆی جیهان،

هەمووی دەگەڕێنەوە سەر زبانی کەونارای کوردی کە زبانی ئاوێستایی یە و ئەوڕۆ ئەو ووشانەی کە لە زبانەکانی ئاوێستایی و پەهلەوی و پارسی کەونارا و سەنسکریت و سۆمەری ماونەتەوە، تەنانەت ووشەکانی زبانی عیبری، هەمووی لە کوردی ئەوڕۆدا هەیە و هەر بەو چەشنی کەونارا لە زبانی پیرۆزی کوردیدا ماونەتەوە. کاتێ مێژوو دەخوێنینەوە، سەرەتای مێژووی کورد لە مادەکانەوە دەست پێ‌دەکا، لە حاڵێکدا مادەکان یەکێ لە هۆزەکانی کوردبوون و هەروەها هۆزی پارسیش لە هۆزەکانی کوردبووە. مێژووی ماد بە پێ‌ی مێژووی هیرۆدۆت ـ کە هەمووی درۆ و دەلەسەیە ـ دەگەڕێتەوە ٢٦٩٩ ساڵ لەمەوبەر، لە حاڵێکدا بە پێ‌ی ئاسەوارە کۆنەکان، مادەکان لە ٩١٢٨ ساڵ لەمەوبەردا پاشایەتیان هەبووە. هەر ئەم هیرۆدۆتە درۆزنە، پاشایەتی کووروۆشی مادی ـ کە بە هەڵە پێ‌ی دەڵێن هەخامەنیشی!! دەگەڕێنێتەوە ٢٥٥٥ ساڵ لەمەوبەر، لە حاڵێکدا، لە پەڕتووکی تەوراتدا، کە بە پێ‌ی خودی جوولەکەکان، تەورات هی چوارهەزار ساڵ لەمەوبەرە، باسی کووروۆشی مادی کراوە و کووروۆش بە مەسیح و رزگاری‌دەر ناوبراوە. ئەگەر تەورات چوار هەزار ساڵ لەمەوبەر باسی کووروۆشی کردووە، دیارە کووروۆش زۆر بەر لە برواری نێو براو ژیاوە و جا ئێوە برواری ٢٥٥٥ لەگەڵ برواری تەوراتدا بەراورد بکەن. بەم هۆیەوە تەنانەت بروارەکانی نووسراو لە مێژووی هیرۆدۆتدا هەمووی درۆ و دەلەسەیە. فەلسەفە و زانستی بژیشکی، لە ئێرانی کەونارادا سەری هەڵداوە. خودی ووشەی ئێران لە ئایر و ئاگر هاتووە و ووشەیەکی کوردی‌یە و هیچ پێوەندی‌یەکی بە هۆزی فارسەوە نییە.

بە پێ‌ی لێکۆڵینەوەکانی زبان‌ناسی، زبانی ئاریایی هیند و ئەورووپی دایک، زبانی کوردی کەونارابووە. زبانی هۆزی ئاریایی سۆمەرییەکان، هەر ئەم زبانی کوردی ئێمە بووە. خەتی بزماری هی کوردانی هووری ـ سۆمەری‌یە کە دروستیان کردووە. سۆمەرییەکان بە خۆیان خوەرۆکی و هووری‌یان وتووە و خۆرپەرست بوون. پرفسۆر ل.و. وادیل W.waddel ، مامۆستای زانستگەی لەندەن، لە ساڵی

١٩٥٢ ی زایینی دا، لە هیندووستان دا ئاسەوارێکی دۆزیەوە کە نیشان دەدا سۆمەریەکان، لە هۆزی ئاری و زبانەکەشیان زبانی ئاریایی یە. ئەو ووشانەی کە ئەم پرۆفیسورە هێناویە، پیشان دەدا کە زبانی ئەم هۆزە گەورەی ئاری یە، زبانی کەونارای کوردبووە و ووشە سۆمەریەکان لە دووای هەزاران سەدە، هێماڵە زبانی کوردی ئەورۆدا بەکار دەبرێن.

جوولەکەکانی زایۆنیزم، بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە بەرلە مووسا، هیچ پێیغەمبەرێك نەبووە، لە هەر کوێ کەسێ بەر لە بڕواری ژیانی مووسایان دۆزیوەتەوە، مێژوویان تێك داوە و هەموویان گۆڕاوە. بۆنموونە ووشەی سۆمەریان داتاشیوە و هۆزی کوردی هۆری یان کردۆتە سۆمەری و پێوەندیان بە تەوراتەوە بەستۆتەوە. سوومەر لە درۆکانی یەکێ لە جوولەکەکان بە نێوی لەنرمانە کە لە ساڵی ١٨٧٣ دا، ئەم ووشەیە لەگەڵ شەنعار لە بەشی دەیەمی تەوراتدا هەڵدەسەنگێنێ و سوون کەیری و ئنجا سوومەری یان لێ داتاشیوە.

هۆزی کوردی ئاکادیشیان لەگەڵ سامی یەکان دا لە یەك بنەڕەت زانیوە!! ئەمە هەمووی درۆکانی ئەوانەن کە نایانەوێ فەرهەنگ و زانستی مەزنی کورد و ئێران، خۆی بنوێنێ و هەمووشتێ دەبەستنە خۆیانەوە و دژی ئاری یەکان رادەوەستن.

لە بارەی هیرۆدۆتەوە، تەنانەت هەندێ لە نووسەرانی رۆژئاوا، ئەویان بە درۆزن زانیوە، وەکوو: کۆرت مارك، کە لە بیستەمی ژانویەی ١٩١٥ دا لە بیرلەن لەدایك بووە و لە نووسراوەکەی دا دەڵێ: «نەتەنێ نابێ هیرۆدۆت بە بابی مێژوو بزانین، بەڵکوو دەبێ بەو بگوترێ بابی درۆزنەکان.»

بە داخەوە ئەورۆ گەلی کوردیش، درۆکانی یۆنانیەکان و درۆزنەکان پات دەکەنەوە و گەورەترین دژایەتی لەگەڵ فەرهەنگی خۆیان دا دەکەن. یەکێ تر لە درۆکانی یۆنانیەکان، هێرشی ئەلکساندری مەکدوونیيە بۆسەر ئێران. بە پێی لێکۆڵینەوەکانی مێژووناسی، کەسێك بە نێوی ئەلکساندری مەکدوونی هەر نەبووە و ئەمەش درۆیەکە کە دایان تاشیوە. چونکی هیچ ئاسەوارێك کە بیسەلمێنێ کەسێك

بە نێوی ئەلکساندری مەکدوونی بووە، تا ئێستایە نەدۆزراوەتەوە، جگە لە ٥٠٠ سکەی درۆینە، کە هی پێنجسەد ساڵ لەمەوبەرە و خەڵکی ئیسفەهان ئەم سکەیانە دروست کردووە و وێنەیی مێهری ئەشکانیان بە وێنەی ئەلکساندری مەکدوونی داوەتە قەڵەم. سلووکیەکان لە مێژووی ئێراندا درۆیە و ئەم درۆیەش هەر یۆنانیەکان دایان تاشیوە. شەڕی داریووشی سێهەم لەگەڵ یەکێ لە خزمەکانی خۆیاندا بە ناوی ئەشکەنتاری ئەشکانی بووە کە ئەم کەسە بە مێهری ئەشکانی ناسراوە و مێهری ئەشکانی چونکی مێهری ـ خۆرپەرست ـ بووە، لەگەڵ ئایینی مەزدەیەسنادا هاتووە و شەڕی نێوان ئایینی زەردەشتی و مێهری بووە کە لە دوایی‌دا مێهری‌یەکان سەرکەوتوون. تەنانەت داریووشی سێهەم کاتێ لە حاڵەتی گیانە لادابووە، تەخت و تاجی پاشایەتی ئێران بە ئەسکەندەری ئەشکانی دەسپێرێ دەڵێ: تێ بکۆشە ئەم تاج و تەختە نەدەیتە دەستی نەیار. کاتێ داریووشی سێهەم لەگەڵ ئەسکەندەری ئەشکانی‌دا بەم شێوەیە دەدوێ، دیارە ئەسکەندەر، ئەلکساندری یوونانی نەبووە و جگەلەمە، ئەلکساندری یوونانی، بە پێ‌یە درۆکانی هیرۆدۆت و ئەوانی تر، ٣٣ ساڵ ژیاوە. لە ماوەی ئەم سی‌وسێ ساڵەدا، هەموو جیهانی ئەو کاتەی چلۆن توانیوە داگیر بکاو بێتە ئێران ئینجا بچێتە هیندو ـ کە ئەمەش درۆیەکی زلە و ئەسکەندەری مێهری، یەکێ لە کوردەکانی مێهری بووە و هیچ پێوەندیەکی لەگەڵ کە سایەتیەکی درۆینە بە نێوی ئەلکساندری مەکدوونییەوە نییە.

ئەمە مێژووی ئێمە یەکە کاتێ چاوی لێ‌دەکەین، هەمووی درۆیە و تەنانەت دەڵێن: کوورۆشی مادی، دژی دوایین پاشای ماد، ئاستیاك هەستاوەتەوە. لە حاڵێك‌دا بە پێ‌ی مێژوو، کوورۆشی مادی، کچەزای دوایین پاشای مادبووە و چونکی ئاستیاگ کوڕی نەبووە، کچەزاکەی دەکاتە جێ‌نشینی خۆی و ئیتر هیچ سەرهەڵدانێ رووی نەداوە و تەنانەت هەخامەنشی داتاشراوە و کوورۆش بە کوورۆشی مادی ناسراوە.

بەر لە هاتنی تاتەکان و لە نێوبردنی ئاسەوارەکانمان، کورد ١٦ ئەلف و بێ‌ی

بووە وەکوو: ١- دین دەبیرە، کە گەورەترین ئەلف و بێی جیهانە و ٤٨ پیتی هەیە و چواردە پیتی دەنگدارە. ئاوێستای پیرۆز بەم ئەلف و بێیە نووسراوە.

٢- وێش دەبیرە، کە ٣٦٥ پیتی هەبووە و هەموو شتێکیان بەم ئەلف و بێیە نووسیوە. تەنانەت نۆتەکانی مۆسیقا بە پێی ئەم ئەلف و بێیە داتاشراوە. بەم ئەلف و بێیە، هەموو دەنگێکیان نووسیوە، وەکوو پەلەوەرکان، مالّات و ولّسات، ئاهەنگەکان و...

٣- گشتە دەبیرە. ٢٤ پیتی هەبووە و بەم ئەلفبایە، پەیمان نامەکان و فرمانەکانیان پێ نووسیوە. هەروەها پارەوتەونیان بەم ئەلفبا نووسیوە.

٤- نیو گشتە دەبیرە؛ هی زانستی بژیشکی و فەلسەفە بووە و ٢٨ پیتی بووە.

٥- شادەبیرە؛ ئەم ئەلفبایە تایبەتی بە پاشایان بووە و بۆ خەڵکی قەدەغە بووە و رازو نهێنیەکانی وڵات بەم ئەلفبایە نووسراوە.

٦- ئام دەبیرە. ئام و هام و هەموو یەکێکە. ئەم ووشەیە کەتاتیدا بۆتە عام. ئەم ئەلفبایە تایبەتی بە خەڵکییەوە بووە.

٧- رازدیرە، ٤٠ پیتی هەبووە و پاشایان راز و نهێنی خۆیان پێ دەنووسی

٨- فەروەردە دەبیرە، نامە تایبەتیەکانیان پێ دەنووسی.

٩- راس دەبیرە، ٢٤ پیتی بووە و فەلسەفە و مەنتیقیان پێ دەنووسی.

١٠- داد دەبیرە، ئەلف و بێی فرمان و دادگەری.

١١- شارهەمار دەبیرە؛ ئەلفبای خەزێنەداری وڵات.

١٢- کە دەهەمار دەبیرە؛ ئەلفبای حەسێب و ژماردن.

١٣- گەنج هەمار دەبیرە؛ ئەلفبای گەنج و خەزێنە.

١٤- ئاهر هەمار دەبیرە؛ تەوێڵە و ئاخورەکان.

١٥- ئاگران هەمار دەبیرە؛ ئەلفبای ژماردن و حەسێبی ئاگرگەکان.

١٦- رەوانگان هەمار دەبیرە؛ ئەلفبای بژیشکی و...

ئەمە نموونەیەکی چکۆلە لە فەرهەنگ و زبانی کەونارای کوردی بەر لە

هێرشی درندانەی تاتەکان بووە. ئەگەر بێم و باس لە زانستەکانی دیکەی فەرهەنگی کوردی بکەم، هەزاران لاپەرەی دەوێ. بەم هۆیەوە دەبێ هەرکوردێکی ئاری شانازی بە کوردایەتی خۆی بکات و ئێمە رەگەزی بەرزی جیهانین و یەکەم رەگەزین لە جیهاندا کە فەرهەنگ و شارستانیەتمان پێك هێناوە. بە داخەوە ئەورۆ هەندێ کەس نایانەوێ راستیە مێژووییەکان خۆی بنوێنێ و گەورەترین هەژمە و کەسەر، خودی ئێمەین کە تاکوو ئێستایە نەمانتوانیوە یەکێتی لە نێو خۆمان داپێك بێنین. بۆنموونە کاتێ یەکێ لە رێبەرە گەورەکانی کورد، وەکوو سەرۆك ئاپۆ = رێزدار ئۆجالان، بە دەستی تورکیای تاتی وەحشی یەخسیر دەکرێ، هەندێ لە بەناو رێبەرانێ کورد، پەیامی شاباش بۆدرندەکانی تورکیا دەنێرن. لە سنەدا پتر لە دەیان کەس شەهید دەبن و کۆمەڵگای مەدەنی خاتەمی بەم شێوەیە دەسەلمێنرێ و دیاری خاتەمی بۆ کوردی ئێران دەبێتە قەڵاچۆی ژنان و مندالانی سنەیی و ورمێیی و بەم شێوەیە جامیعەی مەدەنی خۆی دەنوێنێ. مێژووی گەلی کورد پڕیەتی لە هەژمە و ئاسۆرو وەرهەم. کاتێ کەسێ پەیادە بێ و لەبارەی فەرهەنگ و زانستی ئاهۆرایی کوردەوە دەدوێ، هەزاران کەس دژی هەڵدەستن و دەیدنە بەر سەر کۆنە و تانە و تەشەرەوە.

ئێمە لە بواری شیعر و وێژەش دا، یەکەم نەتەوەیەك بووین لە جیهاندا کە وێژە و شیعرمان داهێناوە. سەیرێکی گاتاکانی ئاشۆزەردەشتی کورد بکەن و بروانن چ پەرتووکێکی پڕبایەخە. شیعری دەبڕگەیی و ١٢ بڕگەیی و ١٦ و ١٨ بڕگەیی و ٨ بڕگەییە. کێش و پاشیلکی هەیە. ئەم ئاسەوارە بە نرخە هی چواردە هەزار ساڵ لەمەوبەرە. لێرەدا بۆنموونە، بەندی یەکەمی گاتەکان دێنم تا بۆمان دەربکەوێ کە ئێمە کێ بووین و چمان کردووە؟

بەشی یەکەم، یەسنا، هاتی ٢٩

«خشمەیی بی یا گێ ئۆش وۆریا گێریژدا
کە همایی ماسۆوەرژ دووم کێما تەشەت
ئاما ئەئێش مۆهەزەس چا

ڕێمۆ ئاهوش یا دێرێش چا تیٚویش چا
نوونیت مۆیی واستا خشمەت ئەنیٚوۆ
ئەسە مۆیی سەنگستا وۆهوو واس تریا.»

وەرگێرانی ووشە بە ووشە:
بۆئێوە خولقێنەری ڕەوان گلەیی کرد
بۆچ ئەزت خولقات. چ کەسێ رای هێنام؟
ئەمن ئارەزوو وستەم و زۆرە ملی، بە تەواوی دووری کردووم
چا چۆلێ بازی و هەروەها زۆر نییە بۆمن جگە لە تۆ پشتیوانێ ئەدی بۆمن ئاشکرای کە شیاوێکی رزگاری دەر.

وەرگێرانی شیوا:
...اوی زەمین دەنالێ لە درگای ئاهۆرەمەزدە کە بۆچ ئەزت خولقاند؟ چ کەسێ رای هێنام و بوونی پێ بەخشیم؟ لە هەموو لایەکەوە رق و ستەم و ئازار و لارەملی هەموو کەسێکی گرتۆتەوە جگە لە تۆ یارمەتی دەر و پشتیوانێکم نییە رزگاری دەرێ کە بمپارێزێ، پێم پیشان بدە.

کێشی کوردی ئەم هەلبەستە:

تەنەن تەن تەنەن، تەنەن تەن تەنەن، تەنەن تەن «١٣ برگەیی».
تەنەن تەن تەنەن، تەنەن تەن تەنەن، تەنەن تەن «١٣ برگەیی».
تەنەن تەن تەنەن، تەنەن تەن«٩ برگەیی».
تەنەن تەن تەنەن، تەنەن تەن تەنەن، تەنەن تەن«١٣ برگەیی».
تەنەن تەن تەنەن، تەنەن تەن تەنەن، تەنەن تەن «١٣ برگەیی».
تەنەن تەن تەنەن، تەنەن تەن تەنەن، تەنەن تەن «١٣ برگەیی».

کێشی تاتی:

مستفعلن فا، مستفعلن فا، مفعولن «١٣ هیجایی».
مستفعلن فا، مستفعلن فا، مفعولن «١٣ هیجایی».
مستفعلن فا فعولن «٩ هیجایی».
مستفعلن فا، مستفعلن فا، مفعولن «١٣ هیجایی».
مستفعلن فا، مستفعلن فا، مفعولن «١٣ هیجایی».

مستفعلن فا، مستفعلن فا، مفعولن «١٣ هیجایی».

ئەمە نموونەیەك بوو لە هەڵبەستە فەلسەفی و عێرفانیەکانی ئاشۆزەردەشتی کورد، کە چواردە هەزار ساڵ لەمەوبەر هۆنراونەتە وە و وێژە و ئەدەبی کۆنی کورد لە جیهان‌دا دەسەلمێنێ.

لەبارەی ئەم پەرتووکەوە:

برای بەرێزم: مامۆستا مەلا محەمەد محەمەدی، بەرپرسی بڵاوکەرەوەی محەمەدی سەقز، ساڵێك لەمەبەر، چەن شریتی پێدام کە شیعرەکانی مامۆستای رەوانشاد مەلا غەفوور دەباغی بە دەنگی خۆی بوو.ئەزیش ماوەیەکی زۆر خەریکی نووسینەوەی شیعرە کان بووم و ئنجا چەند جار پێدا چوومەوە و ئێستاکە بە یارمەتی ئاهۆرەمەزدەی دڵۆوان، ئامادەی چاپ و بڵاوبوونەوەمان کردووە. مامۆستا مەلاغەفوور دەبباغی، ناسراو بە حافزی مەهابادی، دەبێ بە یەکێ لە هۆنەرە هەڵکەوتەکانی کورد بدەینە قەڵەم، تەنێ شتێ کە دەبێ لەبارەی هۆنراوەکانی ئەم کەڵە هۆنەرەوە بگوترێ، بە داخەوە زۆر ووشەی بیانی «تاتی» لە هۆنراوەکانی وی‌دا دەبینرێ کە دەبوا مامۆستا مەلا غەفوور، لە ووشە رەسەکانی کوردی کەڵکی وەرگرتبا. هەرچەن بە بیروارای ئەز، ٩٩ لە سەدی ووشە تاتیەکان ئێرانین و موعەرەب کراون و تاتەکان شتێکیان نەبووە، جا دەبا مامۆستا مەلا غەفوور[1] و هەڵسەنگاندنیان لە روانگەی وێژەیی‌یەوە، دەخەمە هەل و دەرفەتێکی تر و هیوادارم گەلی کورد، شانازی بە مامۆستایان و خۆیان و زبانەکەمان و فەرهەنگە ئاهۆراییەکەمان بکەین.

هەر بژی کورد و ئێرانی کوردوستان.

ئەیدوون بێ.

تاران، بەهاری ٩١٢٨ی کوردی

فارووق بۆرەکەیی «صفی‌زادە»

مێهرکیش ئاوێستا

---

١- لە ووشە رەسەنەکانی کوردی کەڵکی وەرگرتبایە. توێژینەوە و بەررەسی هۆنراوەکانی مامۆستا مەلا غەفوور.

## دیباچە

شاعێر و هۆنەری هۆزان و رووناك دل و ناسك خەیاڵ، مامۆستا مەلا غەفوور دەبباغی، ناسراو بە حافزی مەهابادی، کوڕی دەروێش عەبدوڵڵا، لە ساڵی ١٣٠٦ی هەتاوی، لە شاری فەرهەنگ پەروەری سەقزدا چاوی بە دنیا هەڵێناوە.

باوکی غەفوور، کە سەری بە کاری دەبباغییەوە خەریك بووە، گیروگرفتی زەمانە دەی کێشێتە بانە. غەفووری سێ ساڵە، لەو شارەدا تووشی نەخۆشی خرۆیکە دەبێ. بەم هۆیەوە بینایی چاوەکانی لە دەستدەدا و خۆی گوتەنی: «ئیدی رووی بەختەوەری نابینێ».

لە تەمەنی حەوت ساڵیدا، باوکی دەینێرێتە خزمەتی میرزا حەمە کەریم، تا لە لای ئەو فێری خوێندنی قورئان بێ. لەوێدا قورئان لە بەردەکا. لەو دەمانەدا ئاگری شەڕی دووهەمی جیهانی هەڵگیرسابوو و دەوڵەتی ئێران رووی لە کزی نابوو. لە ناوچەی بانەشدا حەمە رەشید خان سەری هەڵدابوو.

دەروێش عەبدوڵڵا، بابی مەلاغەفوور، بانە بەجێ دێڵێ و روو دەکاتە شاری مەهاباد. لەم شارەدا مەلا غەفوور، لە خزمەت پیاوێك بە نێوی مەلا ئەحمەدی حاجی بایز، درێژە بە قورئان خوێندن دەدا و لە ماوەی هەشت ساڵدا هەموو قورئان لە بەردەکا.

ئنجا لە سەر ئەمری باوکی، لە خزمەت زانایەکی پایەبەرز بە نێوی حاجی مامۆستا مەلا حوسێن مەجدی، وێژە و زانستەوێژەییەکان دەخوێنێ. لە خزمەت مامۆستا مەلا خالید وەحید دەربەندیش، کە پێش نوێژی مزگەوتی سوور بووە، زانستەکانی ئایینی فێر دەبێ. بەشێك لە شەرحی عەقاید لە لای مامۆستا قازی محەمەد خزری، ئیمام جومعەی شاری شنۆ، کە ئەو کات لە مەهاباد داژیاوە، دەخوێنێ.

مەلا غەفوور دەگێڕێتەوە: «لە ساڵەکانی ١٣٢٩ تا ١٣٣١ی هەتاوی، کە هات و چۆی مزگەوتی سوورم دەکرد، ساڵەکانی سەرەتای کاری وێژەیی من بوون.

لەو کاتانەدا جار و بار هۆنراوەم دەهۆندەوە، بەڵام چونکی کەسێکم نەبوو کە بۆم بنووسێتەوە، زۆریان فەوتان و لە نێوچوون. تەنگ و چەڵەمەی ژیان وای لێ‌دەکرم کە هەندێ هۆنراوە بهۆنمەوە کە خۆم قەتم پێ خۆش نەبوون، وەکوو شێعری مەدح و تەمجید. لە تەواوی دەورانی ژیانم‌دا ئارەزووم بووە کە نانی ئارەقەی نێو چاوان و حاسڵی ڕەنجی دەست و باسکی خۆم بخۆم، بەڵام بە سەد داخ و کەسەرەوە لە کۆمەڵگای خۆمان‌دا قەتم بۆ نەلواوە و ئەو حەسرەتەم هەر لە دڵدا ماوەتەوە.»

لە هات‌وچۆی نێو فەقێ‌یان‌دا، مەلا غەفوور بە یەکجاری دەبێتە هۆگری شیعرو بە کوردی و فارسی کۆمەڵە هۆنراوەیەکی جوان دەهۆنێتەوە و هۆنراوەی زۆربەی هۆنەرە بە نێو بانگەکان تەخمیس دەکا.

لە ساڵی ١٣٥٠ی هەتاوی، نووسینگەی تایبەتی نابینایان «نووسینگەی بریل» فێر دەبێ و بە کاری دەهێنێ.

مەلا غەفوور لە زۆربەی بوارەکانی شیعردا سەرکەوتووە وەکوو، تەخمیس، وەرگێڕان، تەنز، هۆنینەوەی قسەی نەستەق و پەندی پێشینان، هۆنراوەی کۆمەڵایەتی و ...

ئاسەوارە بە نرخەکانی مامۆستا مەلا غەفوور:

١- دیاری مەهاباد، کە لە ساڵی ١٣٦٣ی هەتاوی‌دا بە چاپ گەیشتووە.

٢- پەندی پێشینان، کە هۆنراوەیە و هێما چاپ نەبووە.

٣- چوارینەکانی مامۆستا فەڕوخی یەزدی، کە لە سەر کێش و ئاهەنگی خۆیان کراونە کوردی.

ئەم بلیمەتە لە ڕۆژی یەك شەممە، ١٣٦٩/٥/٢١ی هەتاوی، ١٢ی ئووتی ١٩٩٠ی زایینی، ٢١ی گەلاوێژی ٩١١٨ی کوردی کەونارا، کۆچی دوایی دەکا و لە گۆڕستانی مینەوی بوداق سوڵتانی مەهابادا، لە تەنیشتی هۆنەر و وێژەوانی گەورەی کورد، مامۆستا هێمن‌ی نەمردا بە خاك ئەسپێردراوە.[1]

---

١- ئەم کورتە بەسەرهاتی مامۆستا مەلا غەفوورە، لە پەڕتووکی: نگاهی به تاریخ مهاباد، نووسراوی برای خۆشەویستم مامۆستا سەی محەمەدی سەمەدی وەرگیرا.

# ستایشتی یەزدانی مەزن

بۆ: مەلا حەسەنی فەیزبەخش

ئەی خودای کوللی وەخت و کات و دەمان
ئەی بە مەیلت گەڕانی چەرخی زەمان
تۆی لە یەك قەترە ئاو دەهێنیە وجوود
ژیر و کەودەن، دزێو و ئەبرۆکەمان
هەموو لا چەشنی یەك دەپارێزی
لە رەحمڕا هەتاکوو کۆچی نەمان
تۆبەدی هێنەری خەم و شادی
ترس و خۆف و زیان و ئەمن و ئەمان
هەر بە تۆ کۆشکی شاهی دێتە ڕمان
گیان دەکەیتە خودانی مڵکی بەدەن
هەر لە سەر ویستی تۆیە مردن و مان
خوای ئەزەل تۆی و تا ئەبەد هەر هەی
بەری یە زاتی تۆلە وەهم و گومان
رەببی هەر تۆی کە دێی لە فریای ئەبد
دەمی تەنگانە، کاتی لێ قەومان
بۆدەری رەحمەتت پەنا دێنن
بەندەکانت موتیع و نافرمان
کێ لە کۆگای کەرەم بەشی نادەن
دەرکراو نین گەدا لە سەر خەرمان
بە تەمای لوتفی تۆیە یا ئەڵڵاە
کێ بڵێ: لا ئیلاهە ئیلڵەڵڵاە.

ئەی خودای گەورە، خالقی بێ چوون
ئەی بە ئیزنت خولانەوەی گەردوون
ئاشی دەوران لە سەر ئیرادەی تۆ
ورد دەکا لۆرد، زاڵ و زەبوون
لە خەفییاتی بەرپو بەحرا ئاگای
لە خشەی مارو مێروو، هەستی دەروون
هەر بە دەست تۆیە زاد و مەرگ و ژیان
بێ وچان ویستی تۆیە هاتن و چوون
حیکمەتی تۆیە تێر و برسی هەن
خۆت دەزانی لە رەمزی بوون و نەبوون
قودرەتی تۆیە راگری ئەفلاك
نە لە سەر پایەدانران، نەستوون
کائیناتت بە چاو لە سەر یەکنان
خستە بەرچاو بە ئەمری کونفەیەکوون
قەترەیێکە لە بەحری رەحمەتی تۆ
سەتی وەك مانچ و ئەتلەس و جەیحوون
ئەو پەڕی ویستی بەندەکەت ئەمەیە
کە نەبوو ژینی باش و چاوی روون
نە قەرزدار بم و نە بێ ئیمان
کاتێ دەمبەیتە دەر لە دونیای دوون
قەت لە رێ هەتلە نابێ ئیشەڵڵاە
کێ بلێ: لا ئیلاهە ئیلەڵلاە.
ئەی خودای گەورە، خاوەنی دەسەڵات
ئەی بەدی هێنەری هیوا و ئاوات
ئەی کەسێکی کە هەر بە تۆ دەکرێ
ئاڵ و گۆڕی زەمان و کات و سات

بیستن و دین، کەلامی زۆر شیرین
قودرەتی تام، ئیرادە، عیلم و حەیات
بوون و هەر هەن، ئەبەد لە تۆ جیانین
حەوت سیفاتی قەدیمی تۆن، وەك زات
تۆ بەرزتر لەوەی کە پێت راگا
عەقڵ و فام و شعووری مەخلووقات
زەڕڕەیێکە لە عیلم و سەنعەتی تۆ
عەرش و کورسی، لەگەڵ جەمیعی کوڕات
هەر لە دەریا و زەوی، هەتا سیدرەت
هەرچی تێ‌ی دایە، گشتی تۆ هێنات
لە نەبوون پاکی هاتە عەرسەی بوون
نەك حەشیمەت، تەواوی مەوجوودات
خوایە تۆ عیزەت و جەلالی خۆت
خوایە سوێندت دەدەم بە زات و سیفات
چاو بپۆشە لە سووچ و تاوانم
بم بە ناو ریز و پۆلی ئەهلی نەجات
ناکەوێتە عەزابی ناروڵڵاه
کێ بڵێ: لا ئیلاهە ئیللەڵڵاه
ئەی خودای بێ‌شەریك و تەنیا و تاك
زاتی بەرزت لە هەر ئیرادێ پاك
ترسی لێتە، هیواشی زۆر پێتە
ماخەلەق، تۆ بەری لە ترس و باك
بیری تەشبیهی مووقەڵەش کوردە
دوورە، ناگا بە تۆوزەی ئیدراك
بەزەییت زۆرە دەر هەقی ئەبدان
ڕۆحمی تۆ زیاترە لە باب و داك

بە نەسیمی هومێد دەپشکوێنی
دڵی زۆر مات و عاجز و خەمناك
خوانی پڕنێعمەتی زەویت راخست
بۆگەلی گیان لەبەر، خراپ و چاك
دۆست و دوژمن دەژین بە نانی تۆ
دێنە سەر سفرە، تەمبەڵ و چالاك
هۆی پتر بوونی رزقە، شوکرانە
ناشکووری رۆژی خۆر ئەدا بە هیلاك
خوایە تۆزاتی لایە زاڵی خۆت
تۆبی ئەخلاقی حەزرەتی لەولاك
پێم کەرەم کەی ژیانی سەر بەرزی
بە قەرزداری نەمبەیە ژێر خاك
بە هیوای عەفوی تۆ دەژی، وەڵڵاە
کێ بڵێ: لا ئیلاهە ئیلەڵڵاە
ئەی خودای بێ نیاز و بێ هاوتا
ئەی وجوودت بەری لە حەیس و مەتا
خۆت ئیرادەی نەکەی، کەسێ بمرێ
مەرگی حەتمی دەکەیتە لەرزوتا
بە نەخۆشێك بدەی شیفای عاجیل
دەردی پێ مردنی دەبێ بە پەتا
قەڵەمی جوود و عەفو و بەخشینت
خەت دەکێشێ گوناە و سووچ و خەتا
جاری واشە بە ویست و مەیلی تۆ
بێ خەتایەك ملی دەچێ بە پەتا
حیکمەتی تیایە هەرچی تۆ دەی کەی
هەڵە هەرگیز نییە لە کارەکەتا

کێ بە ڕاست و دروستی تۆی ناسی
بە ختەوەر بوو بە فەیز و لوتف و عەتا
کێ ئەمەگ ناشناس بوو وەك قاروون
چوو بە گلّدا لە ئەوجی سەڵتەنەتا
جوودی تۆی پێ گەیی، بوو حاتەمی تەی
شۆرەتی چوو بە شارو مەملەکەتا
هەرچی خۆشت دەوێ لە دنیای تر
والە جێی خۆش و ئاسوودە و ڕەحەتا
ژینی ئەولای چ خۆشە ماشەڵڵاە
کێ بلێ: لائیلاهە ئیللەڵڵاە
ئەی خوداوەندی زولجەلال و تاق
نووری تۆروون دەکا هەموو ئافاق
تیشکی تۆیە ئەدا لە رووی مەعشووق
دەرفێنێ ورە و دلّی عوششاق
وای بە سەر دێ ژیانی پێژانە
وەسڵی لا جەننەتە، جەحیمە فیراق
سەرەتای عیشقی تۆیە شۆری مەجاز
دلّ کە سووتا، بە تۆ دەبێ موشتاق
وەحی تۆی پێ کراوە مێشکەنگوین
شیرە گیاوگولّ دەکاتە شان و ڕەواق
یەن فەدوو ئیندەنا دەچێ بە فەنا
مالەنا فان و ما عیندە کە باق
هەر ئەتۆی گیان ستێن و گیانبەخشی
گیان لە بەر چاو لە دەستەیا ڕەززاق
بەرەکەت تۆ دەخەیتە دەغلّ و دان
تاقە دەنکێك دەبێتە چەن گولّ و ساق

کێ لە حاست لوتفی تۆ سەری هەڵدێ
ناسپاسیش لە ڕۆژی ناکەی عاق
نوقمی بێ ئەمری یە و خەتایە، کەچی
لە موجازاتی دا دەکەی ئیرفاق
دەنگی دەرواتە بەر لە قائولڵاە
کێ بڵێ: لا ئیلاهە ئیللەڵڵاه
ئەی خودای بێ ڕەفیق و بێ ئاواڵ
ئافەرینەندەی کوڵاو و کاڵ
ئەی لە ئەوسافی تۆ قەڵەم کۆلە
لە بەیانت زمانی زانا لاڵ
تۆ خودایێکی پاك و بێ باکی
دوور لە حەدس و گومان و وەهم و خەیاڵ
هیچ نیازت نییە بە ئەبدانت
ئەبدەکانت دێنە دەرکی تۆ بۆ سواڵ
تەنزیئول مولکە بێ، چ توئتیل مولك
ڕەمزی مەحزە ژینی تیر و ڕەجاڵ
بە توزیللوو تۆیززوو سابیت بوو
خێر بە دەست تۆیە، قودرەتی تۆزاڵ
پرسیار ناکرێ لە کردەی تۆ
بەندە بەرپرسە، دێتە سوکری وەباڵ
تیبقی ئێعلامی ئیننە ئەکرەمەکوم
نەکەشیدەت لەلا گرنگە، نە شاڵ
نە کەوای شۆڕو مێزەرو ریشە
نە عەبایە، نە چەتفەیە و نە هەگاڵ
ئەوی لای تۆ بەرێزە، تەقوایە
ئەهلی تەقوان بە بەخت و خۆش ئیقباڵ

دەژی لەولا بە بێ قرە و هەڵڵاه
کێ بڵێ: لا ئیلاهە ئیللەڵڵاه
ئەی خودای بەرز و خاوەنی جەبەڕووت
ئێحتیاجیان بە تۆیە پۆشتە و رووت
عارف و عامی، عاسی دادەگرێ
مەوجی دەریای رەحمەتت کە بزووت
زۆر دەترسێ لە شیددەتی قەهرت
ئەوی جێی چۆتە مەرتەبەی مەلەکووت
خۆفی تۆکار بکاتە کەڕووبین
خۆت رەحم کەی بە عالەمی ناسووت
عاد و قەومی شوعەیب و تاقمی رەئس
چوون بە دەردی دوو هۆزی ساڵح و لووت
جوو قەواریان نەما بە قەهری تۆ
چوون بە ئەرزا، نەتاقی دەرچوو، نەجووت
باخ و بێستان و ئاووکانی ئەوان
بوو بە دەشتێکی قاقر و بەرەهووت
بە هیلاك دان و بەختەوەر کردن
تەسەل و تێر و بێ زەواد و قووت
رێگر و جەردە، ئەولیای کیرام
کۆك و پۆشتە و شرۆڵ و رووت و قووت
بەرز و نزمی بەشەر بە دەست خۆتە
پاکی مەخلووقی تۆن، بە تۆ مەربووت
ناهومێد نین لە تۆ عیبادوڵڵاه
کێ بڵێ: لائیلاهە ئیللەڵڵاه
ئەی عەزیز و موهەیمین و جەببار
تۆی شەدید و لعیقاب و تۆی غەففار

هەرشیای تۆیە عیززەت و عەزەمەت
قودرەتی تۆیە داگری ئەقتار
لیمەنیلمولکو سەبتی کرد، هەر تۆی
مالیکولمولکو واحید و لقەههار
شیددەت و حیددەتت وەلەرزە دەخا
فەرش تا عەرش و گومبەدی دەووار
قەهری تۆ بێ سنوورە، مەیلت بێ
ماسیوەڵلا دەبەیتە قەعری نار
بەندەیێکت بخەیتە بەر غەزەبت
سەر سەرای لێ دەکەیتە ژەهری مار
مەرحەمەت بێتە جێی رق و قەهرت
شوانە وێڵەش دەچێتە جێی سەردار
بەو کەسەی تازیەداری ئازیزە
تۆ دەبەخشی ئیلاهی سەبر و قەرار
خۆش بە حاڵی کەسێ لە رێی تۆدا
گیان و ماڵ و بەدەن دەکا ئیسار
تۆ عەتا بەخشی، هەم خەتا پۆشی
بۆ عەبد دادەپۆشی عەیب و عار
نای خەیە بەر عیقابی مەقتوڵڵاه
کێ بڵێ: لا ئیلاهە ئیللەڵڵاه
ئەی خودای بێ لەزیر و بێ مانەند
ئەی موبەڕڕا لەکەی، لە چۆن و چەند
هەر ئەتۆی سانیعی هەموو ئەشیا
خاوەنی ئاوەکانی جاری و مەند
دڵی یار و نەیار لە دەس تۆدان
خۆت لە بەینی دڵان دەخەی پەیوەند

تۆ خودایێکی کە یەخودات ناوێ
بێ‌نیازی لە وەعز و نەسحەت و پەند
کرمی بێ‌چاو لە ناو قەڵەشتی بەرد
غەیری تۆ رزقی خۆی لە کێ‌ی تر سەند
وەکوو ئەو کرمە چاوەڕوانی تۆن
شا و گەدا، موستەمەند و سەروەتمەند
سووڕدەمێنێ لە کاری تۆ سەریان
چەشنی یەك بێ‌سەواد و دانیشمەند
لە بڕێ جێگە شین و گابۆڕە
لە بڕێ جێ زەماوەنە و گۆوەند
بووکی بۆ دێ‌یەکێ، یەکێکی تر
خۆشەویستی خرایە کۆت و بەند
خۆت لە کاری هەموو کەسێ ئاگای
لە کەم و کووڕەکان و زۆر و زەوەند
جێیەتی بەر نووای زیڵڵوڵڵاە
کێ بڵێ: لا ئیلاهە ئیللەڵڵاە

ئەی خودای موستەعان و حەی و غەفوور
رۆژی تۆیە دەگا بە مار و موور
کوللی وەخت و سەعاتێ دەی‌بیسی
دەنگی ئەبدانی خۆت، نزیك و دوور
ئەی کەسێکی کە ناوی بەرزی تۆی
لە زەوین نووسی خوێنەکەی مەنسوور
خۆرەتا و تۆزێ نووری تۆی پێ‌درا
ئاسمان و زەوی دەکا پڕنوور
وادی ئەیمەن بە تیشکی فەیزی تۆ

بوو بە جێی قەدرو ڕێزی مووسای توور
دەست و پێی ساحیران بڕا، هەربوون
لە سەر ئیقراری خوایەتی تۆ سوور
تۆ مەسیحت هێنا زمان، تاکوو
شاهیدی پاکی دایکی بێ لە فجوور
بوو بە گوڵخانە مەنجەنیقی خەلیل
چون لە لای تۆوە پێی درا دەستوور
ئاوی تۆفان کە قەومی نوحی گرت
سەری هەڵدا لە ناو گڕی تەندوور
خوایە تۆ ئەنبیای ئولولعەزمت
خۆت مەعافم بکەی لە جورمی قسوور
بەزەیی زۆرە هەق تەعالەڵڵاە
کێ بڵێ: لا ئیلاهە ئیلەڵڵاە

ئەی خودای بێمەکان و خورد و خاو
یادی تۆ ژەنگی دڵ دەکا زاخاو
تۆی کەسی بێکەسان و مەزڵوومان
خۆتی فریادرەسی هەموو داماو
کەس کەسی کەس نییە لە تەنگانە
هەر ئەتۆی پشتیوانی لێقەوماو
هەر شتێ ناوی بەرزی تۆی تیابێ
پیت و پێزی بە لاشە وەك لێشاو
هەر شتێ ناوی تۆی لەگەڵ نەخرێ
بێدەوامە، دەبێتە بڵقی سەراو
ئەی کەسێکی بە ئەمر و مەیلی تۆ
ساڵەها پێکەوە دەڕۆن دووئاو

تالّ و سوێرەیەکیّ، یەکێکیان خۆش
وەتی هەن پێکەوە، نەبوون تێکڵاو
پەردەیەکە لە بەینی ئەو دووانە
دەرکی ناکا بە هیچ کلۆجیّ چاو
غەیری تۆکیّ دەزانیّ ئەو پەردە
لە چی پێك هاتووە و بەچی بەسراو
دەرکی زیندانەکان بە تۆ دەشکێن
هێزی تۆدەیپسێنیّ بەند و داو
بۆعەبد تۆڵەسێنی یا ئەڵڵاە
کیّ بڵیّ: لا ئیلاهە ئیللەڵڵاە

ئەی خودای بانی سەر، بینای چاوان
ڕێنوێن و دەلیلی داماوان
زاتی پاکت قەدیم و هەر پاکی
ناوی بەرزت بەرێزترین ناوان
چی موقەددەر کراوە بۆعەبدت
نووسراوە هەمووی لە نێو چاوان
عەجەل و رزقی گیان لە بەر، بیّشك
پیّی دەگا پاکی، گەورە یا ساوان
فەززەڵە بەعەزەکوم ئەلا بەعزین
بوو بە تۆفیری رۆزی شا و گاوان
لایقی شەئنی تۆیە عەفو و سزا
دەرهەقی عەبدی پڕ خەتا و تاوان
خوایە هەرتۆبە لوتفی خۆت دەگری
لانی هیوا بڕاو وتیّ شکاوان
بەندی هەر چاوەڕوانی رۆحمی تۆن

دەست و پێ بەستراو و گیراوان
گەلی گیاندار لە تۆ دەکەن هاوار
کاتێ زاڵم دەیان خەنە داوان
لان زەلیل بێ پەنان، پەنایان تۆی
تاقمی دڵ شکاو و بێ چاوان
موستەهەققی کەرەمتە یا ئەڵڵاە
کێ بڵێ: لا ئیلاهە ئیللەڵڵاە

ئەی شەدید و لمیهاڵ و بەتش و عیقاب
بێ سەر و قەهر و دەهشەت و ئیرعاب
حەجمی کەونەین و سەققەلەین لە بەر
هەیبەتی تۆ نیانە تین و تاب
ئەی عیلەیکەل مەعال و وەلمەرجیع
نییە بۆ غەیری تۆ مەسیر و مەعاب
لە سەر ئەو قەومە موفسیدەی فیرعەون
تۆ رژاندت ئەشەددی سەوتە عەزاب
ئەفلەحە هەرچی نەفسی خاوێن کرد
کێ بە فێڵ و دەسیسە بوو قەدخاب
هەرچی بۆ لات گەڕاوە، دەیبەخشی
عەفووی تۆ جاری‌یە، ئیلامەن تاب
رەحمەتی تۆ کە بێ حەد و مەرزە
هەب لە نامین لە دونکە یا وەهاب
کاری هەرکەس کە تۆ پەسندی کەی
بێ نەسیب نابێ خاوەنی لە سەواب
هەرچی تۆی لێ رەزابی، سەر بەرزە
تووشی تووش نا بە قەد لە رۆژی حیساب

مولحیدی تۆقوڕی بە سەر، لەولا
کوێ پەناگایەتی، ئیلەیکە ئیباب
نابێ قەد دوورە بەش لە عەفوەڵڵاە
کێ بڵێ: لا ئیلاهە ئیللەڵڵاە
حەی و قەیووم، ئەی خودای عالەم
پەلەوەر، جانەوەر، بەرەی ئادەم
پاکی مەخلووقی تۆن و تووشیان دێ
چی موقەددەر کراوە خاتر جەم
لە نەخۆشی و بەلا و موسیبەت، تا
خێر و خۆشی و سەفا و بزەی هاودەم
عالیموسسیری، وەلخەفیاتی
رازیقولرزیزقی خەڵکی، زۆر تاکەم
کەیف و ماتی عەبد بە دەست خۆتە
بەڕەزا و مەیلی تۆیە شادی و خەم
خۆت ئیرادەی نەکەی، کەسێ گەش بێ
رۆژی روونی دەکەیتە هەور و تەم
حەزبکەی بەندەیەك دڵی خۆش بێ
بۆی بە لەبخەند دەگۆڕییەوە ماتەم
خۆت دەخولقێنی نان بدە و کوێر نان
یەك دەبەخشێ بە سەهلی، یەك حەستەم
هەردوو لایان بە ئەمری تۆ خولقان
مەبخەلی رژد و پیاوی وەك حاتەم
خوایە خۆت خاتیمەم وەخێر گێڕی
تۆبی چوار یار و حەزرەتی خاتەم
قسمەت و رزقی بەریە بەیتوڵڵاە
کێ بڵێ: لا ئیلاهە ئیللەڵڵاە

ئەی خودای گەورە، مالیکی کەونەین
خالقی خەڵك و رازقی سەقەلەین
فی کەبەد قەد خەلەقتە لئینسانە
سوممە تەجمەللی ئەجریهی عەینەین
تاکوو فێر بێ رمووزی نوتق و بەیان
پێت کەرم کرد لیسان و هەم شەفەتەین
تا بیانووی نەمێنێ بۆدوا رۆژ
ئەنتە یارەب هەدەیتەهون نەجدەین
بیستنیش لازمی بوو وەك بینین
پێت عەتاکرد لە پاشی چاو، ئوزوونەین
چاوو گوێت بۆیە دا بە بینیادەم
بێتە خاوەن شوعوور و عەقڵ و زەین
تۆبناسێ و موتیعی ئەمرت بێ
خۆی نەکا تووشی مەخمەسەی دارەین
خوایە تۆئەو کەسەی شەوی مێعراج
زۆر نێزیك بوو لە تۆبە قەد قەوسەین
تۆحەیا و حیلمی حەزرەتی عوسمان
تۆبی ئیمانی لافەتاو شەیخەین
لە گوناهم ببوورە تا لەولا
نەیەتە گەردنم وەبال و دەین
شامیلی هەر دەبێ عەتا ئوڵڵاە
کێ بڵێ: لا ئیلاهە ئیللەڵڵاە
ئەی خودای بەندەناس و بەندەنەواز
هەر بە تۆیە کزی و دەماخی ساز

حەللی موشکیل بە تۆ دەبێت و بەس
یا کەریمە لنەتا، ئەتۆی کارساز
هەرچی نەیدیوە کەس، لە تۆ دیارە
واقیفی تۆ لە سەر نهێنی و راز
کوللی ئانێ درێژ دەکەن بۆلات
چی غەنی و بە نەوایە، دەستی نیاز
ژینی دنیا و قیامەتی تالە
هەرچی بۆ زیکری تۆ نەبێ دڵخواز
عەبدی سپڵە و خراپ و نافەرمان
رۆژێ دەگرێ لە پشتی دەستی گاز
خۆت هیدایەت نەدەی کەسێ رێی راست
ون دەکا، لادەدا بەرە و هەوراز
پێ نەزانان و بێ ئەمەگ لە کوێن
شك دەبەن رۆژی رەش، مەفەڕ و مەلاز
ئەی نابەن بەڕێوە ئەمری زەکات
ئەوی هەرگیز نەبوون دەس و دڵباز
عەبدی نەفس و موتیعی شەیتانن
وێڵ و گومراترن لە ورچ و بەراز
سەیرە لادا لە دانی حەققوڵڵاە
کێ بڵێ: لا ئیلاهە ئیللەڵڵاە .

ئەی عەزیمولشەئن، خودای موتەعاڵ
لایقی زاتی تۆیە عیزز و جەلال
نە وەکو کەس دەچی، نەکەس وەك تۆ
نییە بۆ خوایەتیت شەبیە و میسال
ماوەرای حەدد و حەسرە قودرەتی تۆ

فەوقی دەرکی شعووره، کوانێ مەجال
ناگرێ کەس لە کاری تۆ رەخنە
نییە بۆ چووك و گەوره مافی سوئال
خوایەتیت ناگەرەکیە جەرپ و بەحس
نایەوێ قیل و قالّ و ئیستیدلال
شاهیدی حەمدی تۆیە ئیممین شەیع
لە زمان چیاو داری دەشت و جیبال
مارو موور و مەلەك، یوقەددیسولەك
فێری تەقدیسی تۆن، تەمام و کەمال
مانگ و رۆژ و فەلەك، هەتاکوو سەمەك
سەببە حەلیل ئیلاهی جەللە جەلال
خەڵقی دوو داری شینی ئاتەشزا
لە سەر ئیسباتی قودرەتی تۆدال
یادی تۆوەك شیفایە بۆبیمار
لە دڵیش رادەماڵێ حوزن و مەلال
شاد و دڵ خۆش دەبێ بی زیکرولّلاه
کێ بڵێ: لائیلاهە ئیللەڵلاه

ئەی خودای زولمینەن، سەمیع و بەسیر
ئەی بە مافی سدوور، ئەلیم و خەبیر
غافیلیززەنب و قابیلیتەوبی
عەفووی جورم و خەتا، عەلەیکە یەسیر
هەم شەدید و لعیقابی، زیتەولی
هەم کەسیر و لمەعافی، لیتەقسیر
ئەی کەسێکی لە بەینی خواردن و خوێن
رزقی خۆش تام و پڕ لەزەت وەك شیر

بە وجوود دێنی بۆ عیبادی خۆت
پێی دەبووژێنەوە سەغیر و کەبیر
زۆر شتی تر لە شیر دەبن پەیدا
ماست و قەیماغ و مەیلە، رۆن و پەنیر
باشترین پێبژیوی ئینسانن
بوونە قووتی منداڵ و جوان و پیر
چون بەشەر ناسپاس و بێ سفەتە
زوو هەواو نەفسی لێی دەکا تەئسیر
هەرکە خۆی دی لە ناز و نێعمەتدا
خوایەتی تۆی مەحاڵە بێتەوە بیر
کێ تەماح دەرکی دا دەخا وەکرێ
رەببی هەر بۆ حەکیم و پیاوی بیر
چۆن دەبێ نەگرێ دەستی خەڵقوڵڵاە
کێ بڵێ: لا ئیلاهە ئیللەڵڵاە

ئەی خودای لایەنام و عەززەوەجەل
کاری دیژوار و موشکلت لا حەل
هیچ شتێکت لە لا بزر نەبووە
چ گوزەشتە، چ حاڵ و موستەقبەل
لە هەموو هەست و خوست خەبەرداری
لە خورەی ئاو هەتا جریوەی مەل
هەم لە سروەی سەبا، شنەی شەوبا
کە دەجوولێ گەڵا و گوڵ و سەرپەل
تۆ لە عەبدان نێزیکتری یارەب
لە رەگی مل، لە جومجومە و مەفسەل
زۆر لە عەبدانی تۆ نەقوستانن

گۆج و ئیفلیج و کۆڵ و کوێر و شەل
بێدەلیل ناتەواو و نەخولقاون
محەکی تاقی کاری‌یە بۆ گەل
تاکوو روون بێتەوە لە کاری باش
کێ ئیرادەی بەهێزە، کێ تەوەزەل
خوایە تۆ گەورەیی نەبی ئەکرەم
تۆبی ئەسحابی ئەفزەلی مورسەل
رۆژی حەشر و جەزا بە مەرحەمەتی
خۆت لەگەڵ کوێر بکەی، نەتیبقی عەمەل
نابێ ئیجرا لە سەر وی حوکمولڵاە
کێ بڵێ: لا ئیلاهە ئیللەڵڵاە

ئەی خودای زولجەلای وەلئیکرام
رەحمەتی تۆ دەگا بە خاس و عام
ئەی کەسێکی بە هیچ کەسێ نەدرا
لە تەرەف تۆوە ئیختیاری تام
رۆژی دوایش بە بێ ئیجازەی تۆ

هەر بە تۆ دێنە خواریّ بەرزەفران
هەر لە تۆوە زەعیف دەگەن بە مەقام
هەر بە تۆ ئەهلی کیبرو دەعیە و فیز
پلەیان پەست دەبیّ، دەبن بە غولاّم
ئەرحەمو رڕاحمینی بۆ داماو
فەیزی تۆیە ئیلاهی مەلهەمی زام
دڵی رۆشن دەبیّ بە تەقوەڵلاّه
کیّ بڵیّ: لا ئیلاهە ئیللەڵلاّه

ئەی خودای گەورە، حەزرەتی باری
هەرکە بارانی رەحمەتت باری
ئەرزی مردوو لە نویّ دەکەی زیندوو
لە حەیاتیش نەما بیّ ئاساری
بەرگی سەوزی لە بەر دەکەی دیسان
هەڵ دەدا سەر گیا و گوڵ و داری
بابە دەستوور و ئەمری تۆ بەفراو
لە کەژ و کێوەکان دەکا جاری
زەمهەریر ئاڵ و گۆڕ دەبیّ بە شنە
دێوی سەرما دەچێتەوە غاری
سەخڵەتی گۆڕی گوم دەکات و بەهار
دێتە سەر تەرمی زوقم و سیخواڕی
خونچە گوڵ بۆنی عیشقی تۆی لیّ دیّ
بۆیە بولبول لە سویّی دەکا زاری
نووری تۆی تیایە شەم، کە پەروانە
بۆی دەسووتێت و نایە هاواری
لانی کیّ بگریّ بارەکەی بارە

هەرچی تۆی لانی، کەوتووە باری
خۆزگە هەرچاو لە دەستی تۆبوایەن
نابینا، نەك بژین بە سەرباری
کاری راست دێ بە کۆمەکی ئەڵڵاە
کێ بڵێ: لا ئیلاهە ئیللەڵڵاە

ئەی خودای لەم یەزەل، ئەلیم و حەکیم
ئەی سیفاتت جەمیعی خاس و قەدیم
ئەی کەسێکی کە هەر بە تۆ دەکرێ
خەڵکی رزگار بکەی لە وەحشەت و بیم
دەهشەتی تۆ سەبا دەکا بە سەبوون
رەعفەتی تۆ سەبوون دەکا بە نەسیم
خوایە تۆ لەم جیهانە رەحمانی
بۆعەبد لەو جیهان غەفوور و رەحیم
کێ بەرە و تۆ هەڵێنێ هەنگاوێك
تۆ دە هەنگاو دەچی بە لوتفی عەمیم
کێ بە دڵ خۆی بخاتە ماڵی تۆ
رێزی دەگری بە قەد وەلی‌یی حەمیم
بۆ فریوە مەقامی دنیایی
تۆی سزاواری گەورەیی و تەعزیم
مەنشەعی کوللی خەڵکی لات سەهلە
زیندوویان کەیتەوە ئیزامی رەمیم
کێ نەسەڵمێنێ ژینەوەی دوایی
خۆی دەبینێ لەگەڵ عەزابی ئەلیم
رەببی نەشکێ زمانم ئەو کاتەی
گیان بە گیان ئافەرین دەکەم تەسلیم

خوایە بیبەخشی تۆ کە لامولڵاە
کێ بڵێ: لا ئیلاهە ئیللەڵڵاە

ئەی خودای ئاو و خاك و ئاگر و باد
رازقی بێزمان و ئادەمیزاد
چی لەمابەینی ئەروز و ئاسمانن
ئیحتیاجن بە کۆمەك و ئیمداد
دەمی تەنگانە گیان لە بەر، پاکی
لێت دەکەن عاجزانە ئیستیمداد
رەفعی تەنگانەیان بوو، ناتناسن
سپڵە کوا بیردەکەن لە رۆژی مەعاد
یا ئیلاهی لە سەر گەلان کورت کەی
دەستی ناپاکی زۆر و ئیستیبداد
بە وزەی قەهر و شیددەتی غەزەبت
هەڵی وێزنی بیساتی زوڵم و فەساد
شەوەزەنگی بە سامی بێدادی
ئاڵ و گۆڕکەی بە نووری عەدڵ و داد
رابگەی خۆت بە دادی مەزڵوومان
غەیری تۆ خوایە بەرنە بەرکێ داد
*نوقمی دەریای عەزابی خۆتیان کەی
کوللی فیرعەونەکانی زیل ئەوتاد
کۆڵەوارتر لە عالەمی دنیان
تۆرەمە و پا شەکەوتی هۆزی ماد
یاری کاری بە تۆرەسوولەڵڵاە
کێ بڵێ: لا ئیلاهە ئیللەڵڵاە

ئەی خـودای کـردگار و حەی و جـەلـیـل
سیفـەتـی بەرزی تـۆن، حـەسـیـب و وەکـیـل
تـۆ کـە پـەروەردگـار و خـەلـلاقـی
خـوایـەتـی تـۆنـیـازی کـوا بـە دەلـیـل
لـە پـلـەی قـودرەتـت نـمـوونـەیـەکـە
ئەوی هـێـنـات بـە سـەر سـەحـابـی فـیـل
ئەبرەهـەت بـۆ هـەمـیشـە سـەرکوت کـرد
کـەیـدەهـوم بـێ ئـەسـەر بـوو فـی تـەزلیـل
پـەرە سـلـێـرکـە بـوونـە چـەکـدارت
چوونـە سـەریـان بـە بەردی مـیـن سـیـجـیـل
فـیـل سـوار تـاقـی دەرنـەچوو، یـەکـسـەر
کـەوتـە بـەرزەبـری هـێـزی تـەربـابـیـل
هـاتـبـوون گـوایـە تـێـك و پـێـکـی دەن
بـەیـتـی پـیـرۆز و یـادگـاری خـەلـیـل
خـوایـە وەك ئـەبـرەهــەت قـەڵاچـۆکـرد
دژی مـووسـات خـزانـدە ئـاوی نـیـل
قـەومـی لـووتـت بـە عـام سـەرە و ژێـر کـرد
لای بـەیـانـی بـە شـاپـەڕی جـیـبـریـل
وەرە فـریـای گـەلـی سـتـەم لـێ کـراو
کـوردی بـەدبـەخـتـی ژێـر چـەپـۆك و دیـل
خـۆت هـەقـی بـۆبـسـێـنـی یـا ئـەڵـڵا
کـێ بـڵـێ: لا ئـیـلاهـە ئـیـلـلـەڵـڵا

ئەی خـودای موقـتـەدیـر، ئـیـلاهـیـنـاس
مـالـیـکـی دووجـیـهـان و رەبـیـنـاس
ئەی کـەسێـکـی کـە خـۆی بـە تـۆ ئـەسـپـارد

خۆشەویستت لە وەسوەسەی خەنناس
مەجد و تەقدیس و حەمد بۆ تۆیە
پێشکەشی زاتی تۆیە شوکر و سوپاس
چون بەشەر دەستی حورمەتت لێنا
بوو بەخێوی شەهامەت و ئیحساس
بوو بەماقوڵترینی چەندین نەوع
لە خەلایق بە ئیمتیازی خاس
بە موزەی تۆ دەژین، کەچی زۆربەی
بەندە بێ چاوو روون، نمەکنەشناس
هەرکە دەستی گەیشتە دەم، زوو خۆی
ون دەکات و دەچێتە دەر لە لیباس
ماڵی دنیای دەنی لە حاستی تۆ
چاوی بێنوور دەکات و گوێی کەڕو کاس
نەفسی زل ئادەمی دەبا بە هەڵە
تووشی چەوتی دەکات و ڕێی ناڕاس
قەت دڵی عەبدی عاسی ناشکێنێ
لێت بپاڕێتەوە لە رووی ئیخلاس
حورمەتی دەگری بەین و بەینەڵڵاە
کێ بڵێ: لا ئیلاهە ئیللەڵڵاە

ئەی خودای ئەرز و ئاسمان، تۆی فەرد
ناوی پیرۆزی تۆ دەوای هەر دەرد
ئەی کەسێکی کە پیشەیان زیکرو
حەمد و تەسبێحی تۆیە دار و بەرد
بە سەناو شوکری تۆوە مەشغوڵن
هۆزی وەحشی، تیووری کێو و هەرد

چڵ بە چڵیان بە ئەمری تۆ دەڕوێن
داروبار، دەغڵ و دان و شیناوەرد
بە تەمای تۆیە چاندن و کێڵان
ڕۆزی دەر تۆی، ئەگاسن و شێوەرد
بە وجوود دێنێ تۆلە یەك ماددە
پیاوی زۆر بەرزو پەستی زۆر نامەرد
ڕاست و لە درۆبە دوور و چەوت و چەوێڵ
ناحەز و جوان ڕوو گەش و ڕەنگ زەرد
گێڵ و وریا، سپی لەش و ڕەش پێست
ساف و بێ کینە، بێ بەزە و دڵ بەرد
گورگ و مەڕ، نادروست و جێ ی باوەڕ
هار و بێ هەست و خوست و پیسکە و مەرد
حیکمەتی تۆیە خوو وخدەی جیاواز
وەك لە عەرزایە گەرمەسێر و سەرد
کاری تۆی لا بە جێ یە عەدبەڵڵاە
کێ بڵێ: لا ئیلاهە ئیللەڵڵاە

ئەی خودای لەم یەلید، وەلەم یوولەد
زاتی پاکت ئەزەلی ی و ئەبەد
لە سیفاتی بەڕێز و بەرزی تۆن
حەی و زولقووە تیل مەتین و سەمەد
نە خەوت باتەوە و نە خەوەنووچکە
نە بە هاوکوفە حاجەتت، نە وەلەد
وەسفی تۆلایو ئەدوەلا یوحسا
دوایی نایە بە پێ ی ژومار و عەدەد
غەیرە ناتیق، تەواوی بێ کەم و کاس

گیان نیسار و موتیعی تۆن، بێ حەد
لە بەشەردایە چیدی بێ باوەڕ
بەشی زۆریان موریبن و موعتەد
مونکیری زاتی تۆ و روسوڵ هەربوون
ئەن سەبیلیك ئیلاهی بوونە تە سەد
سوودی بۆ تۆ چی یە کە ئینس و جین
بێنە سەر سوجدە بۆ خودایی ئەحەد
زەڕڕەیەکیش زەرەر بە تۆ ناگا
کائینات بێتە مولحید و مورتەد
نەفسی خۆی پێ ی دەگا زیان و سوود
تۆ کە باکت نییە لە نیك و بەد
شەرمی تۆ دەیگرێ مەعازەڵڵاە
کێ بڵێ: لا ئیلاهە ئیللەڵڵاە

ئەی خوداوەندی ئەوەڵ و ئاخیر
خۆت ئەلیمی بە باتین و زاهیر
بۆ موجازات و عەفوو هەر خۆتی
هەم کەریم و حەلیمی، هەم قاهیر
بۆ پەشیمان رەحیم و تەووابی
تۆڵەسێنی لە فاسیق و فاجیر
عەیب و نەقسی عەبدوە دەرناخەی
سڕی بۆ دادەپۆشی، تۆی ساتیر
عالمولغەیب و کاشف ولیسڕڕی
شاهیدی ئەمری، حازر و نازیر
زامنی ژینی پاك و ناپاکی
حۆجەیان پێتە مؤئمن و کافیر

چــی ددان دار و بــێ ددان، گــشــت
بەهــرەمــەنـدن لــە نێـعـمــەتـی وافـیــر
لـە هـەڵـە و ئـیـشـتـیـبا و نـەدامـەت، تـا
سـەهـوونـیـسـیـان دەبووری تۆی غـافـیـر
چڵکی عیـسیـان بـە ئـاوی تۆبە دەشـۆی
خوایە هـەر تـۆی موفـەهـهـیـر و تـاهـیـر
سـەیـیـئـاتیش دەچـێ بە بـای حـەسـەنـات
عـاتـیـفـەی مـەحزە ئـەی خـودای قـادیر
قـودسـیـان پـێ ی دەڵـێـن: هـەداکـەڵـڵاە
کـێ بڵـێ: لا ئـیـلاهـە ئـیـلـلـەڵـڵاە

ئـەی خودای رۆژ و شـەو، غەنی و حـەمید
خاوەنـی لـەوحی بـەرز و عـەرشی مـەجید
ویـسـتی خـۆتە لـە بـەینی خـۆف و رەجـا
دەیـژیـێـنـی عـەبد بـە بیم و ئـومـیـد
وەك بـە عـیـدت لـە لادە بێتـە قـەریـب
تیبقی مەیلت قـەریبت دەکـەی بە بـەعید
تـا بەشـەر رێ ی نـەمـێـنێ بـۆ سـوڵـتـاغ
پێت نـیـشـانداوە رێ ی شـەقـی و سـەعـید
یـا لــە دوا رۆژ مــیــوانـی ریـزوانــن
یـا دوچـاری مـەقـامـیـمـن لـە حـەدیـد
خۆش بە حـاڵـی ئـەوانە وان لـە سـوجـوود
حـەق تـەعـالا دەکـەن سەنـا و تـەمجیـد
خـۆش بـە حـاڵـی ئـەوانـە بـۆ دنـیـا
هـەتڵە ناکـەن شـەقامـە رێ ی تـەوحـیـد
تـا ژیـان بـاقـیـیـە دەکـەونـە شـوێـن

ڕەوشی حەزرەت و کەلامی مەجید
تەعلەموو ما تووەسویسو نەفسوە
چون نێزیکتر ئەتۆی لە حەبلی وەرید
خوایە تۆزاتی خۆت مەعافم کەی
لە سزای دۆزەخ و عەزابی شەدید
جورم و تاوانەکانی یەمهوڵڵاە
کێ بڵێ: لا ئیلاهە ئیلللەڵڵاە

یا سەمیعولدوعا، قەریب و موونیب
ئەی لێعەبدین ئیزا دەعاکە مووجیب
چی مووقەددەر کراوە بۆ عەبدت
ڕۆژی قالووبەلا، لە رزق و نسیب
بەر لە دوواکۆچی خۆی وەری دەگرێ
چی نەسیبی عیبادی خۆتە یووسیب
دوو مووسەتییر لە تۆوە مەئموورن
کردەوە و گفت و گۆ دەکەن تەعقیب
کار و گوفتاری بەندەکان، پاکی
دێتە ناو دەفتەری عەتید و ڕەقیب
ڕۆژی دوایش لە دادگای عەدڵت
نەفس و ئەعزایەتی گەواە و حەسیب
بۆدەبێ سپڵەبێ بەنی ئادەم
دێتە دنیا غەریبە، ڕۆی غەریب
کێ ی‌ترە غەیری تۆ لە هانای بێ
بۆهەموو دەرد و مەرگی خۆتی تەبیب
نییە ئیللا بە زاتی تۆ تەوفیق
ئە تەوەککەل ئەلەیك ئیلەیکە ئونیب

بەندە دەنگی دەگاتە تۆ بێ پارت
خۆت کە فەرمووتە: مین هوئیننی قەریب
دێتە گوێی بانگی ئەنهوو رەزی یەڵڵاە
کێ بڵێ: لا ئیلاهە ئیللەڵڵاە
ئەی خوداوەندی بێ کەس و یەکتەن
بۆ عەبد تاڵە زیندەگی یەکتەن
هەر شیای تۆیە بێ کەسی، یارەب
ئەی مونەزە لە قەیدی ماوومەن
بێ نیازتر لەوەی کە حۆجەت بێ
بە کوڕو کیژ و ماڵ و حاڵ و ژەن
سەرەتاکەی بە کفلە کوونێک بوو
خەڵقی ئینسان، تۆحید و هو ئەهوەن
یەسجد و نانی لەکە، بە بێ رەکە
گیا و گژی سەر زەوی، نزار و دەوەن
خالقول باریعولهادی سوبحانەك
چی لە دەریا و سەرا و سەمادا هەن
جیا لە نەوعی بەشەر، کە بێ سیفەتە
پاکی دەستووری تۆبە رێوە دەبەن
بەهرەکان ببنە جەوهەری نووسین
وەسفی تۆیەك لە سەد تەواو ناکەن
قودرەتت ئاو دەکاتە بەردی رەق
خەشیەتی تۆ دەکاتە ئاو؛ ئاهەن
ئەی کەسێکی کە رۆژی تاریک
کردە جێی تایبەتی شەوی رەوشەن
حیکمەتی مەحزە رۆژی زۆر و کەم
رەمزی خاسە درێژ و کورتی تەمەن

جێیەتی پێی بڵێن جەزاکەڵڵاه
کێ بڵێ: لا ئیلاهە ئیللەڵڵاه

خوایە تۆ خوای هەموو دەم و کاتێ
دانەری هەر نیزام و ئەشتاقی
چونکی پێوستی ژینە مەعکوولات
هێنەری دەغڵ و دان و داهاتی
هۆگری میوەجاتی نەوسی بەشەر
مونبیتی لێرەوار و باغاتی
تا مرۆ گۆشت و شیری لێ نەبڕێ
خاڵقی وەردە ماڵ و ماڵاتی
بۆ ئەوەی چاو و دڵ پێیان وەکرێ
نەشئەبەخشی گوڵ و نەباتاتی
کاشیفولهەمی و لعومومی کەزا
دافیعولکەربی، وەلبەلیاتی
خوایە هەر تۆ خەفەت دەتارێنی
هەر بە تۆلادەچێ کزی و ماتی
زەرەر و زیان بە تۆ دەبێ جوبران
قەرەبووی بۆ دەکەی خەساراتی
محەکی بەرز و نزمی ئیمانە
بۆموسوڵمان بەلا و بەسەرهاتی
بەندە بێ‌دەستەڵاتە، تۆی حەلال
بۆگرێی موشکل و موهیمماتی
رەفعی ئیشکالی بۆدەکا ئەڵڵاه
کێ بڵێ: لا ئیلاهە ئیللەڵڵاه

ئەی خودای ئاسمانی بەرز و زەمین
مالیکی هەردووکەون و یەومووددین
خاوەنی دووسەران، لە یەك جیاواز
دۆزەخی پڕ عەزاب و خولدی بەرین
دوو مەکانن، نەسیبی هەموانن
مالّی دوایی لە بۆغەنی و میسکین
جێی ئەوانەی موتیعی تۆن یەکیان
نوقمی خۆشی و سەفا و بزەی شادین
لەوی تر نیشتەجێن بەرەی ناپاك
ئەو کەسانەی کە موجریم و عاسین
دەستەیەك لایەمووت وەلایەحیان
دەستەیەك هاونشینی حوورولعین
قووتی بەدکار لە داری زەققوومە
خوا پەسن، گۆشتی مەل، کەرە و هەنگوین
خواردنەوەی هەق نەناسە ئاوی حەمیم
ئەهلی تەقوا، رەحیق و مائی مەعین
خۆش بەحالّی کەسێ لە دنیای دوون
تا ژیا دەستی گرت بە حەبلی مەتین
فانی کردە فیدای سەرای باقی
تووری هەلّدا تەماح و نەفسی لەعین
قەد نەبوو موشکولّەزمە بۆ ئەولاد
شوێنی دواکۆچی خۆی نەکرد ئاورین
خێر و خۆشی و سەعادەتی ئەبەدی
لانەنا بۆوچانی تاوێك ژین
خۆش بەحالّی کەسێ لە ئاکارو
خوو وخدەی ئەو، خودا و خەلّك رازین

کەس بەدەست و زمان نەڕەنجێنێ
بەقسەی ڕەق دڵان نەکا غەمگین
ڕۆژی دوایی دەچێ بە سەربەرزی
بۆ حوزووری خودا و ڕەسوولی ئەمین
لەشی داناگرێ عەزابەڵڵاه
کێ بڵێ: لا ئیلاهە ئیللەڵڵاه

یا سەریعولحیساب، یا مەننان
لا تەحسنووسسەواب، یا دەییان
بێ جگە لەو سەعی و کۆششەی دەیکا
تیبقی فەرموودە، لەیسەلیلئینسان
کردەوەی خۆی دەبینێ ئەو ڕۆژەی
خوای عەزیموششەعن دەکا دیوان
خوایە تۆ ئەو موحەممەدەی ناردت
بێتە هۆی ڕەستگاری ئینس و جان
بوو بە ڕێنوێن و ڕەهبەری عالەم
بە خەڵاتێکی گەورە وەك قورئان
ئەو کتێبەی کە دوژمنانی دین
لە بەرەنگاری مات و مەبهووت مان
حافیزی ئەو کتێبە ماقووڵە
خۆتی ئەی خاوەنی زەوین و زەمان
خوایە تۆ ئەو کەسانە وا حەزرەت
قەولی چوونی بەهەشتی زوو پێدان
دە نەفەر بوون کە وەعدەیان پێ درا
خولەفای ڕاشدین لە پێش هەموان
دوای ئەوان تەلحەیە و زووبەیر و سەعد

بوو عوبەیدە و سەعید و ئەورەحمان
قەدرو ڕێزی هەیە لە کن ئەڵڵاه
کێ بڵێ: لا ئیلاهە ئیللەڵڵاه

خوایە تۆ ئەو سەحابە گەورانە
بۆرەسووڵت کە بوونە پشتیوان
تۆبی ئەو پیاوە بەرز و زوبدانە
کە بە تۆیان دەبەخشی ماڵ و گیان
تۆ ئەوانەی لە جەنگی بەدر و ئوحود
خوێنی گەشیان ڕژا لە ڕێی یەزدان
بیکە خاتر هەموو سەحابی نەبی
تابێعین و تەواوی پیاوچاکان
چینی بێ چاو و چارەڕەش لەولا
بیخە بەر عەفوو بەخشش و غوفران
مەینەت و دەرد و ڕەنجی بێ چاوی
ژینی پڕ ئاخ و ئۆخ و ئێش و ژان
چاو لە دەستی و کەنەفتی کافی بێ
بۆموجازاتی کوێری بەستەزمان
سووچ و تاوانی تاقمی بێ چاو
بیخە مل زاڵمانی بێ ویژدان
بەڵکوو چاومان لەوێ بپشکوێنی
بە لەقای خۆت و جەننە تولمەدنان
نابینا و دۆستەکانی مەحفووز کەی
لە موکافاتی مەحشەر و سووتان
سێبەری دێتە سەر لە عەرشوڵڵاه
کێ بڵێ: لا ئیلاهە ئیللەڵڵاه

یا موحەممەدا! حەبیبی حەیی وەدوود
ئەی تۆرا زاتی لەم یەزەل بستوود[1]
هەڵبژێراوی واحید و لەحەدی
پێت سپێرا ئەمانەتی مەعبوود
هەڵبژێرای کە هۆزی جین و بەشەر
شارەزاکەی بە جادە ڕێی مەقسوود
نێردرای مێشك و دڵ وەبووژێنی
بە نیدای حەق، بە مەوعیزەی پڕ سوود
بە وجوودت کەماڵی بەختەوەری
بۆ گەلی دیل و کۆیلە هاتە وجوود
عەرەبستانی وشك و بێ حاسڵ
بوو بە جێی رزق و رۆزی نامەحدوود
خێروخۆشی و سەفا بوو هاتنی تۆ
شار و ئاوایی لێی نەما کەمبوود
تیشکی فەیزت ڕووناکی خستە وڵات
ڕۆیی تاریکی کوفر و جەهل و جوموود
ئیننە مەل مۆئمینوونە ئیخوەتون چووە جێی
شەڕ و کێشە و براکوژی بێ سوود
ئاوو گۆڕبوو ستیز بە سوڵح و سەفا
لادرا شیر و تیر و نێزە و خوود
دینی ئیسلام ئەوانی کردە برا
موتتەقی بوون بە هۆی ڕکووع و سوجوود
ڕات گەیان هەرچی پێت درا دەستوور

(1) ای تو را زات لم یزل بستود

لە تەرەف خالیقی هەموو مەوجوود
خوای ئەزەل وەسفی پەیڕەوانی تۆی
بە وشەی خەیرە ئوممەتین فەرموود
ئەهلی سیدق و دیانەت و تەقوان
لە ئەزەر زولجەلالی خاوەن جوود
ئالْ و ئەسحابی تۆ پەسەندی خودان
دوژمنی دینی تۆ و خودا مەترووود
ئەهلی عسیانی ئوممەتت خاوەن
لێرە ناکا بە قەهری خۆی نابوود
بەر غەزەب ناکەون لە دنیای روون
وەك گەلانی شوعەیب و مووسا و هوود
ئوممەتی عاسی تۆ سزانادا
وەك سزای قەومی لووت و عاد و سەموود
مۆڵەتی دا و نەتێ بە خاتری تۆ
تا دەمی حەشر و دادگای مەوعوود
تاکوو ئەو رۆژە کارنامەی ژین
دێتە روو، کێ قەبووڵە، کێ مەردوود
پێشکەشی گیانی خۆت و یارانت
بێ ژمار و عەدەد، سڵاوو درووود
ئەی کەسێکی خودا ئەتۆی پاراست
لە فرو فێڵی موشریکین و یەهوود
حیفزی کردی بە ئین یەکاد و فەلەق
لە شەڕی موغریزان و چاوی حەسوود
هەم بە یاسین و ئەحمەد و تاها
نێوبران، هەم موحەممەد و مەحموود
رێز لە نێوت دەنێ بە سەلەڵڵاه

کێ بڵێ: لا ئیلاهە ئیللەڵڵاه.

یا موحەممەد، بەڕێزترینی بەشەر
ئیفتیخاری بەنی ڕەبیع و مولەل
هەم دەمی رازی جوبرەئیلی ئەمین
مەحبەتی وەحی خالقی ئەکبەر
ئەی پەنای بێ هیوا و بێ دەرەتان
ئەی هیوای بێ کەسان و بێ یاوەر
ئەی سەراپا وجوودی تۆ ڕەحمەت
مەقدەمت قووتی قەلب و نووری بەسەر
مەکتەبت مەهدی خوڵق و ئینسانساز
مەنشەئی عەدل و داد و دین پەروەر
عومری منداڵی، لاوەتی و گەنجیت
تاکوو ئەو کاتە بووی بە پێغەمبەر
بە سەفا و سیدق و پاکی تێپەڕبوو
بە ئەمینیان دەناسی ئەهلی نەزەر
باب و باپیری تۆ هەتا عەدنان
گشتی ماقووڵ و کەیخودا و سەروەر
خوای عەزیمولشەئن، ریساڵەتی تۆی
بە ڕەسووڵانی پێشوو داوە خەبەر
لە کتێبانی ئاسمانیدا
نێو براوی بە پێشەوا و ڕەهبەر
دینی تۆناسیحی هەموو ئەدیان
موعجیزەت نوتقی بەرد و شەقی قەمەر
مل هوڕان مل کەچن لە حاست فەزڵت
سەرکەشان دادەنێن لە بەر پێت سەر

ڕەببی عالەم کەلامی خۆی بە خەڵات
ناردووە بۆت سەراسەری گەوهەر
خۆیەتی بۆ کەلامی پیرۆزی
تا ئەبەد ئاگەدار و پارێزەر
هێندە خۆشی دەوێ‌ی خوداوەندی موتەعال
ئوممەتت زوو نەجات دەدا لە سەقەر
هێندە مەقبووڵی بێ‌دڵێت ناکا
لێ بخوازی تکا و ڕجای مەحشەر
ئەی بە شیر و نەزیر، سیراجی موونیر
فەخری کەونەین و خاوەنی کەوسەر
تۆ گزنگی هەتاوی بەختەوەری
بۆ هەموو عالەمی خودا یەکسەر
خاکی ڕەوزەی موتەهەرت قوربان
مەڵهەمە بۆ برینی دیوە و دەر
کێ بە ئیرشاد و ڕێ نوێنی تان
چوو بە ڕێدا، مەترسی نایێتە بەر
ئەو کەسەم خۆزگە بەر شیفاعەتی تۆ
دەکەوێ تووشی نایە خۆف و خەتەر
کێ موتیعی خودا و ڕەسووڵی بێ
دوو دنیای بە نەفعە، نەك بە زەرەر
تا لە ڕێ‌ی خوا و ڕەسووڵ، بەخت دەکرا
گیان و ماڵ بۆئەوان بوو فەتح و زەفەر
ئێستە کەوتووینە داوی دنیاوە
بووین بە تەپکەی جەفاوە، وەك پەلەوەر
دیلی پارە و کەنەفتی سامانین
لێك درادین، لەگەڵ زەر و زیوەر

عەبدی خوا و ئوممەتی عاسی تۆین
هیچ پەنامان نییە لە ئێوە بەدەر
تۆی تکاکاری یا رەسوولەڵڵاه
کێ بڵێ: لا ئیلاهە ئیللەڵڵاه

ئەی عەزیمولخولوق، یەمیمەو واج
قولزومی فەیز و قائیری مێعراج
غێرە مەمنوونە لای خودا ئەجرت
زاتی هەق کردی وەسفی تۆبە سیراج
شاهی خاوەن شکۆی لە سەر مڵکی
دین و دنیا ریسالەتی تۆ تاج
تۆ تەبیبی دڵانی بیماری
دەردی کاری بە تۆ کراوە عیلاج
ئەی رەسوولی ئەمین، موبەللیغی دین
دین بە هۆی جیهد و جەهدی تۆبوو رەواج
دین لە سایەی خەبات و هیممەتی تۆ
بوو بە بەرقێکی نەییر و وەهاج
شەبەقی‌دا بە تاریکی و زوڵەمات
رۆژی روون هاتە جێی شەوی رەش و داج
بەحری فەتح و شەپۆلی نەسرولڵاه
بوت و بوتخوازی دایە بەر ئەمواج
خۆت بە چاوی موبارەکت دەتدی
داخڵی دینی خوا دەبوون ئەفواج
بەرزی تۆلەو خودایە دەخوازین
کە هەموو گیان لە بەر بەون موحتاج
ئەو خودایەی کە گیاو دار سەجدەی

بۆ دەبەن بی و چنار و سەرو و کاج
تۆ کەسێکی کە بێدڵی کردی
شاهی ساسان کەوت لە تەختی عاج
حافیزی دینی تۆیە ئەو خوایەی
خەڵقی کردین لە نوتفەتین ئەمشاج
شینی کردین لە گڵ، دەچینەوە گڵ
خۆی دەمانکاتەوە لە گڵ ئیخراج
بۆی دروست کردووین هەتا وەحەسێ
گیان و لەشمان لە جنسی خۆت ئەزواج
خاڵقی دوو جودا لە پاڵ یەکدا
ئاوی ئەزبوو فوڕات و میدح و موجاج
ڕەشی ناکا لە بەر شەرافەتی تۆ
ڕوی خراپانی ئوممەتت وەك ساج
کێ لە سەر دینی تۆنەژی، شەیتان
کردەوەی باشی ئەو دەکا تاراج
تووشی بەدبەختی دێ لە ڕۆژێکا
بە کەڵك نایە ڕشیوەدان و باج
تابیعی تۆیە یا ڕەسولەڵڵاه
کێ بڵێ: لا ئیلاهە ئیللەڵڵاه

یا موحەممەد ئەمینی دەرکی خودا
دەك سەر و ماڵی ئوممەتت بە فیدا
ئەی کەسێکی کە بێ تەفاوەتە لات
لەشی سپی و سوور و زەنگی، شاه و گەدا
ئێمە کوردین و گیان نیساری تۆین
خوا شوکور حەتڵە نین لە ڕاهی هودا

زوو بە دینی موبین موشەڕڕەف بووین
کورد موسوڵمان ژیاوە، سەد لە سەدا
وەتی هاتووەتە سەر زەوی، بۆچی
وەکوو نامۆ دەچێ لە جامیعەدا
کەس ددانی بە خێری پیا نانێ
بەزەیی نایێ کەس بە حاڵی مەدا
ژێر چەپۆك و کەنەفت و دوورە بەشین
هاو مەزەب قەد بە ئێمە مافی نەدا
لە دەیان قەرنەوە هەتا ئێستا
هەرچی حاکم بوو، زەبری خۆی لەمەدا
هەرچی کاری بە دەست بوو، دەستی وەشان
عاتیفە و پیاوەتی نەبوو ئەبەدا
دەمی دەبڕن، زمانی دەردێنن
هەر کەسێ دەم لە مافی کوردی بدا
کێ دەوێرێ حووقووقی شەرعی بوێ
بە پەت و دار و گوللە جوابی ئەدا
دوژمنی داخ لە دڵ گەلێ جاران
راوی ناوین بە شاخ و یاڵ و قەدا
چاوو راوێك بڵاو کراوەتەوە
کێ ی سەبەب بوو خودا دەوامی نەدا
لە گەلی کوردی چارەڕەش گوایە
تۆ دوعات کردبێ ڕەسوولێ خودا
ڕووڕەشی دەرکێ تۆو خوداوەند بێ
کێ دەمی لەم گومان و تۆمەتەدا
قەدری تۆی لایە یا حەبیبەڵڵاه
کێ بڵێ: لا ئیلاهە ئیللەڵڵاه

ئەی خودای ئاسمانی بەرز و زەمین
مالیکی هەر دوو کەون و یەومی دین
خاوەنی دوو سەرای لە یەك جیاواز
دۆزەخی پڕعەزاب و خولدی بەرین
دوو مەکانی نەسیبی عەبدانن[1]
مالّ دواییـن لە بۆغەنی ومسکین
جێی ئەوانەی موتیعی تۆن، یەکیان
نوقمی خوشی و سەفا و بزەی شادین
لەوی تر نیشتەجێن بەرەی ناپاك
ئەو کەسانەی کە موجریم و عاسین
دەستەیەك لایەمووت وە لایەحیان
دەستەیەك هاونشینی حورولعین
قووتی بەدکار لە داری زەققوومە
خواپەسەن، گۆشتی مل، کەرە و هەنگوین
خواردنەوەی هەقنەناسە ئاوی حەمیم
ئەهلی تەقوا رەحیق و مائی مەعین
خۆش بە حالّی کەسێ لە دنیای دوون
تا ژیا دەستی گرت بە حەبلی مەتین
فانی کردە فیدای سەرای باقی
تووری هەلّدا تەماح و نەفسی لەعین
قەد نەبوو مووشقولّەزمە بۆ ئەولاد
شوێنی دواکۆچی خۆی نەکرد ئاورین
خێر و خۆشی و سەعادەتی ئەبەدی

---

[1] دوو مەکانن، نەسیبی هەموانن.

لانـە نـا بـۆ وچـانـی تـاوێـك ژیـن
خـۆش بە حـاڵـی كـەسێ لـە ئـاكـارو
خـوو وخـدەی ئـەو، خـودا و خـەڵـك رازیـن
كـەس بە دەسـت و زمـان نـەڕەنـجـێـنـێ
بـەقـسـەی رەق، دڵان نـەكـا خـەمـگـیـن
رۆژی دوایـی دەچـێ بـە سـەربـەرزی
بۆ حـوزووری خـودا و رەسـوولـی ئـەمـیـن
لـەشـی دانـاگـرێ عـەزابـەڵـڵاە
كـێ بڵـێ: لا ئـیـلاهـە ئـیـلـلـەڵڵاە

---

هیوادارم ئاغەی محەمەدی ئەم شێعرانە گشتیان بێ سانسۆڕ چاپ کات. (٦٧/١٢/١٨)

## بۆ سەرکێڵی گۆرەکانیان

بە بۆنەی شەهیدبوونی دوو خانەوادەی سەردەشتی بە بۆمبی شیمیایی پێشکەش بە برای خۆشەویستم مەلا حەسەنی فەیزبەخش بۆ ئینتیشاراتی محەممەدی

حاجی قادر لە چل وهەشت ساڵی
کەوتە بەر هێرشی بۆمبا؛ماڵی
چووە ناو ریزی شەهیدانی وەتەن
یەك کەرەت خۆی و ژن و منداڵی
چەکی شیمیایی قەلاچۆی کردن
دەك بە مل دوژمنەکەی ئۆباڵی
خۆشکە ئامینە چل ودوو ساڵ بوو
تەمەنی، خاوەنی شەش منداڵ بوو
پێ بە پێی حاجی، بە سەربەرزی وڵات
کردی دوا کۆچ و لە ماڵ و حاڵ و روو
کەوتە بەر رەحمەتی یەزدانی مەزن
چون لە شوێن بەختەوەری ئەبداڵ بوو
بیست و یەکساڵە، جەمیلەی دڵپاك
ژیر و پیتۆڵ و لە ناکەس بێباك
گوڵی ژینی لە نەکاو پەرپەر بوو
بە دەسی دوژمنی زۆڵ و ناپاك
کچی روو سوور و شەهید، جێگیر بوو
تەرمی پیرۆزی لە ناخی دڵی خاك
ئەمەیە گۆڕی شەهید کاکە عەلی
خوا و خەڵك رازی لە کردە و عەمەلی
بێ ئەوەی کامرەوا بێ لە ژیان

گیانی بەخشیوە لە پێناوی گەلی
تەمەنی نۆزدە بوو، بەرداشی عەجەل
نایە ژێر حاڵی لەش و دەست و پەلی
داخی چەن زۆرە، سەعادەت ناکام
حەفدە ساڵ بوو تەمەنی، تازە نەمام
گوڵی ئاوات و هیوای هەڵنەمژی
لە پڕا کەوتە گەرووی مەرگی بە سام
کچ شەهید بوو بە دەسی نامەردان
بۆی بە داخ و کەسەرن؛ خاس و عام
پازدە ساڵ بوو تەمەنی کاك هادی
نایە گڵ دەستی ڕەشی بێدادی
سوور گوڵی لاوی بە شیمیایی وەری
هەڵپسا توو لە نەمامی شادی
دڵی پڕ هەستی لە لێدان وەستا
کەس هەیە ئاخۆ بپرسێ دادی؟
گوڵ شەپۆڵ، شەش بووە ماوەی تەمەنی
ورد و خاش بوو بە دەسی دێوی دەنی
ئەم کچە جوانە بە گازی خەردەڵ
داپلۆخا هەموو گیان و بەدەنی
تۆبڵێی بەم زووە تۆڵەی وەکرێ
لە هەموو هۆز و بەرەی ئەهریمەنی
چۆلەکەی باخی بەهەشت، ڕەحمەتی جوان
بەری دڵ، هێزی جگەر، قووتی ڕەوان
باوەشی پڕ لە سەفا، فێرگەی بوو
بە وشەی پڕ مەزە، دایکی دەدوان
عومری دوو ساڵ بوو، دەسی شیمیاوی

تێکی پێچاوە لە ناو گۆڕی جوان
حاجی خاتوونی فەتاح، بە حیساب
کەیخودا ژن بوو، بە ئیمان و حیجاب
کردەوەی چاك و پەسندی خوابوو
گورج و ئازا بوو لە بۆ خێر و سەواب
شەست و حەوت ساڵ بوو لە دنیا دەژیا
کیمیا جەرگ و دڵی کردە کەباب
لاوی مەشهوور بە خەلیل پوور، ئەمیر
دڵ پڕ ئاوات و هیوا، ڕۆشنبیر
هەژدە ساڵی لە تەمەن تێ دەپەڕی
بۆردمان کوشتی، بە حوکمی تەقدیر
بێ مرادانە سەری ناوە، بەلام
بۆ ئەمیر دڵ بە خەمن، جوان و پڕ
دادە خورشیدی بە شۆرەت؛ کەرەمی
چل و چوار ساڵ بوو، بە بێ زیاد و کەمی
بۆمی زۆرداری بە سەردا باری
ماڵی ئاواتی رمی، گشتی چەمی
ئەم شەهیدەش چووە نێو باوەشی گڵ
بۆمە جێ ماوە کوڵ و دەرد و خەمی
گوڵی سەرچۆپی ژنان، باجە گوڵێ
کێ بەشەر دۆستە، دڵی بۆی دەکوڵێ
پاشی هەفتا، بەگری بۆمی نەیار
هەموو ئازای بەدەنی دادەتلێ
لە خەم و حەسرەتی فرمێسکی گەرم
وەکوو سەرچاوە لە چاو هەڵدەقوڵێ
کاکە رەحمانی خەلیل پوور، پەنجای

لە تەمەن چووبوو، کە شیمیایی کوتای
بوو بە هۆی داخی گران، بۆ گەلەکەی
بە مەراق و کەسەرن، دۆست و برای
پاکی ژێر گڵ بوو لە گەڵ تەرمی شەهید
ئارەزووی مان و تەما و هەست و هیوای
کاك مەلا باقی، هەژار و میسکین
ژیر و لێزان و بە هەست و ورد بین
سابیر و قانیع و رازی بە قەزا
هۆگری تاعەت و خواناس و بە دین
پڕ لە مەینەت بووە ماوەی تەمەنی
خێر و خۆشی نەدی، سەرتاسەری ژین
رۆیی ئەو پیاوە لە دنیای بێ فەڕ
بە دڵی پڕ لە پەژارە و غەمگین
هەر بە شیمیایی، ئەویش دوا کۆچی
کرد و گوێزایەوە بۆ خولدی بەرین
حەوتی تیر بوو کە نیشانەی تیر بوو
ئەو لەگەڵ زۆر کەسی تر، کەوتە کەمین



ساڵی شەست و شەشە، مانگی پووشپەڕ
خەڵکی سەردەشتی هەژار و بێ زەڕ
لە ژن و پیاو منداڵ بگرە، هەتا
لاو و کیژی گەش و گەنجانی بەفەڕ
یەکدڵ و گیان دەژیان لەم شارە
بێ قرە و گێچەڵ و ناکۆکی و گەڕ
هێزی شووم و چەپەڵی زۆرداران
دێوی ئاسمانی بە سام و بەدفەڕ

تێکی پێچانەوە بێ سووچ و خەتا
زۆربەیان خستنە ناو ئاگری شەڕ
گوڵی باخی تەمەنی چەن بنەماڵ
بە دەسی کورد کوژەکان بوون پەڕپەڕ
بە ملی کێوەوەباڵ و دەینی
گەلێ ئینسانی شەریف و لاشەڕ
بۆچیان خستنە سێچاڵی مەرگ
بۆم هەموو قالبی جنی وەك جەرجەڕ
کەس نییە بێژێ بە خاویر پرێز دکۆیار
بە سەری دا بنەڕێنێ وەکوو کەڕ
بۆچی تۆدادی گەلان ناپرسی
دێو دەیانخاتە تەنوور وشك و تەڕ
دەس درێژ بۆبە سزا ناگەیەنی
بۆ گەرووی ناکوشی دێوەزمەی شەڕ
تا لە سایەی تەقەڵاو کۆشینی تۆ
ئاو لە یەك جۆگە وەخۆن گورگ و مەڕ.[1]

---

١- دوو خانەوادەی سەردەشتی بە نێوی ئەسەدزادە و خەلیل پوور، هەموویان بە شیمیابی لە ناوچوون. تەنیا یەك کوڕیان بەناوی مستەفا لە دووا بە جێ مابوو، ئەویش بەختی خۆی لە ماڵ نەبوو. لە سەروێستی مستەفا، ئەم چەن شیعرانەم هۆنیوەتەوە لە سەرکێلی ئەو شەهیدانە بیان نووسنەوە.

# کچی بۆکان

## تەرجیع بەند

شاری بۆکان کچی وای تیایە وەباڵم بە ملی
سۆفی، پەتیارە دەکا، چاڵ و چەنە و خاڵی ملی
شێت دەکا شێخ و مەلا، و حاجی دەکا سەرگەردان
دوو بڕۆی فیتنە گەر و چاوی خومار و بەکلی
یەدی بەیزایە دەسی، موعجیزی عیسا نەفەسی
چاو دەبەخشێتەوە بە کوێر و دەکا دەفعی گولی
ئاورێك بێت و وەدا، پیری نەوەد ساڵە ئەدا
گەسکی بەر پێی بە قەفی سمێڵ و برۆو ریشی زلی
کچی وای تیایە نەخۆشی کەلەلا دێتەوە حاڵ
چاو لە چاوی برێ، نەزمی دەسی بگرێتە قولی
کچی وای تیایە تفی مەڵحەمی زامی تەشەنە
قورسی تەسکینە هەناسەی کە بەرۆك دەست و پلی
دیدە مەستێکە شەڕوور و فێری مەی و مەستی دەکا
هۆش و بیری شەڕی نامێنێ لە بەر گێژ و خولی
لابدا بسك و کەزی، خۆری تەمووز دێتە کزی
رەنگی زەرد هەڵدەگەرێ، ماتە لە شەرم و خەجلی
رووپیشاندا، کەوە پیاوان و مەقاماتی مەزن
بۆی دەنووشتێتەوە، خۆداوێتە سەر قاچ و قولی
ئاخ یەکێ لەو کچە باشانە بپرسێ حاڵم
ژینی تاڵم، سەر و ماڵم دەکەمە قوربانی
کچی بۆکانی نموونەن هەموویان بۆ جوانی
هەر لەوان شیرینە لاوکوشتن و تیر لێدانی
کچی وای تیایە هورەی لۆکە لە حاندی پەسەکە

قاقم و کولّزنەکە لای بەدەنی نەرم و شلی
ئالّ و والّا دەوەشێ لێی و دەنەخشێنێ تەلّا
بەژن و بالّایەتی، هۆی زینەتە بۆ زێر و جلی
وەسفی جوانی کچی بۆکانی بە دە، دوازدە بەیت
ناکرێ، قافیە نایکێشێ هەتا سی و چلی
کچی وای تیایە، بلّند پایە لە بۆی خولیایە
خۆی لە کن شایە، بدا ئیزنی لە بەر پێی وەتلی
فارسی دورناسی بە لادا بچێ تەعزیم کونان
گوید: ای ماە تو ار زندەتر از جان و دلی
عاشقانِ رُخ زیبای تو چون بلبل زار
جملە دیوانە و سرگشتەی همچون تو گلی
ئازەری تووش بێ: دێیر گوێزلەر و قووربان ئۆلووم
چۆخ گۆزەل سەن سەنەما، باشووە دۆلانم، سویَ گوێلی(١)
ئەرەبیش رەنگە بلّێ: ئیرحەمنی، رووحی فیداك
نار و هیجرانی چی، قەد زەووەبەنی، کەل موحلی
چوار مەتاعم هەبوو، پێشکەش کچی بۆکانم کرد
کەس پێیان رازی نەبوو، دەك قوری دنیام بە ملی
زۆر بە شانازی دەکا خزمەتی پێلاوەکەیان
کێ لە ئەندازە بەدەربەرزە پلەی سامانی
کچی بۆکانی نموونەن، هەموویان بۆ جوانی
هەر لەوان شیرینە لاو کوشتن و تیر لێدانی.

---

١- دئیر: گوزلر وە قوربان اولوم، چوخ گوزل سن سنما، باشوە دولانم، سوگولی واتە: دەلێ: بە قوربانی چاوەکانت بم، زۆر دەلال و جوانی ئەی بتی جوان، بە دەوری سەرتا بگەڕێم کە تاقە گولی.

# کچانی سەقز

دیاری‌یەکی کەم نەرخ و ناقابل، پێشکەشی ئەکەم بە کچانی سەقز. بەو هیوایە کە پەسەندی بکەن.

بۆ کچی بەرز و بە ناموسی سەقز، گشتی سڵاو
چ سڵاوێ، کە لە قووڵایی دڵ و ناخی هەناو
دێتە دەر پێشکەشی کیژانی بە ویجدانی سەقز
خاوەنی هێزی هیوا، هەستی بە تین تر لە هەتاو
زۆر بە تام و لەزەت و پڕ مەزەیە پەیغامم
خۆشترە بۆنی سڵاوم لە هەموو عەتر و گوڵاو
بۆ کچی ژیر و بەبیر، دۆستی گەل و دوژمنی میر
بەرنەدا لانی فەقیر، بۆ تەمەن و گۆشت و پڵاو
دڵ نەبەستێ بە پلە و پایە، خووای سەرمایە
چاوی نەبڕێتە تەڵا و کۆشك و قەڵا و شۆرەت و ناو
جێی هەموو بەرزەفڕێ نزمە، وتەی پێشینە
هەستی خۆبینی ئەکا تووشی بە تووشی دانە و داو
بۆ کچان مەرگی گرنگ ئابڕووە، جوانی خووە
عیففەت و عیسمەتە، هۆی حورمەتە لای خاس و خراو
خوو خدەی جوان و پەسەن، بەڵگەیە بۆ ئەسڵ و ڕەسەن
هۆی نەجابەت نیە خانووی زل و ماشێن و دراو
کچ بە هاوشان و جلی جوان و تەڵا هەڵخەڵەتێ
کوڕ بە چاوی ڕەش و کوڵمی گەش و ئەگریجەیی خاو
لە ژیان کامڕەوا نابن و ناگەن بە مراد
بەرهەمی ڕەنجی ئەوان وەرهەمە یا بڵقی سەراو
هەر کچێ شەرمی فرەس، عیزەتی هەس لای هەموو کەس
قەیرە کچ بێ بە تەمەن، یا شلك و تازە ڕواو
ئەو کچە لایق و ماقووڵە لە عەقڵا قووڵە

دژی ویجدان و شەرەف هەڵنەگرێ یەك هەنگاو
کچی دڵپاك و موقەددەس نییە باکی لە تەرەف
دوورە داوێنی لە دەس دوژمنی ناپاك و گڵاو
هەرکچێ وایە، پەسەندی هەموو خەڵك و خوایە
نرخی باڵایە، لە لای پیری و جووان، گەنج و لاو
خاوەنی ئەم خووە بەرزانە لە لای هەرزانە
بە هەموو موڵکی جیهان، نزم و بەرز، وشکی و ئاو
خێوی ئەم خەسڵەتی باشانە چ کچ بێت و چ کوڕ
ڕاگری ئەم هەموو شەرتانە چ ژن بێت و چ پیاو
تاکوو دووا کاتی تەمەن بێ خەم و ئاسوودە ئەژی
لەو جیهانیش هەرەسێ بەختەوەرە و خوا پێداو
دیمەنی ئەم کچە تەرزانە بەبێ لەرزانە
شێری سامناك و بە هەیبەت ئەخەنە لەرز و یاو
ناگرێ بەرگەیی شمشێری برۆو تیری بژانگ
ئەوی ناکاتەوە قەد پشتی لە سەد سواری تەواو
چاو کەژاڵانی سەقز، پیاوی زەبەردەست و بە جەرگ
ئەتەزێنن بە نیگای پڕلە ڕق و تیلەیی چاو
دیدەیی مەستی ئەوان تووشی مەی و مەستی دەکا
ئەو کەسەی دایمە بەر ماڵی گەڕابێ لە سەر ئاو
گشتی سەر شۆڕە لە لای تووڵە نەمامانی سەقز
کاج و سەروی چەمەن و خەڵفی چنار و لاولاو
خونچە دڵ تەنگە کەوەك لێوی ئەوان ناپشکوێ
گوڵە باخ ڕوومەتی ئاڵ کردە کەنەفت و داماو
عەتری شەو بۆی سەری زوڵفانی کچان لە برەوی خست
سوێسنە و سونبل و بەیبوون و هەڵاڵە و گیا خاو
هەموویان جوانی سروشتن، وەکو حۆریانی بەهەشت

بۆ ئەوان ڕەنگە مەلایکە چشت بێتی دەم و چاو
کچی ئەم شارە بە عام گەردن و ڕوو هەڵماڵن
تووشی ڕووزەردی و بێ تینی ئەکەن تێشکی هەتاو
مەبەسم تەرکی حەیا نەبووە لە ڕوو هەڵماڵین
کچی پڕ شەرم و شکۆ جوانە نەڕوو هەڵماڵاو
جوانی وای تیایە، نموونەی کەمە لەم دنیایە
دەمی عیسایە؛ دەمی، بۆ دڵی ناشاد و شکاو[1]
پیری سەد ساڵە بە یەك زەردە خەنەی لێو ئاڵان
تاقەتی دێتەوە بەر گیانی کەنەفت و ژاکاو
ئەوی تا ئێرە وتوومە دەهومی یەك دەهومە
وەسف و تاریفی کچان موشکڵە بۆم بێتە حەساو
کاغەزم چی بوو، قوتار بوو، مەرەکەب وشکەوە بوو
قەڵەمم نووکی شکا، هەشتی لە مشت نەبووە تەواو
لێم ببوورن گوڵەکانی سەقزی سەر بەرزم
چاو بپۆشن لە هەڵەی شاعیری بێ چارە و چاو.

---

١ - لەشی مردوو لە نەکاو.

# غەزەل

## جوان

جوانی سەقز ئێوەن گوڵی سەرتۆپی وڵاتان
جوانانی جیهان گشتی چیان هەس، هەیە لاتان
گوڵزاری ئیرەم پێ کوڵە لای جەننەتی ڕووتان
هەڵنایە سەری، ڕووی نیە حۆری لە حەناتان
گەردی کلە سوبحانییە بۆچاوی ئەویندار
گەردێکە ئەنیشێتە سەر ئەو کەوشە لە پاتان
چاڵی چەنەتان چەشنی سیا چاڵی ئەوینە
شێوەی پەتی سێدارە ئەدا پرچی سیاتان
کێ شێر دڵ و لەش فیلە، بە دەستانەوە دیلە
ڕۆستەم نییە تا بشکێ لە بەر تیری نیگاتان
ئەو ئارەقی بەر گەردەنەتان ئاوی حەیاتە
ئەتکێتەوە سەر سینە بە هۆی شەرم و حەیاتان
ئیعجازی مەسیحا ئەنوێنن بە بزەی لێو
بۆهەرچی نەخۆشینە شیفا بەخشە لیقاتان
بینایی ئەبەخشێتەوە دووبارە بە بێ چاو
تۆزێ گڵی بەر قاپیەکەی حەوشی سەراتان
نوێنگەی مەزنی سەنعەت و وەستایەتی خوایە
مەوزوونی قەدو قامت ڕووی پڕلە سەفاتان
بۆدەردی کوت و پڕنەفەسی ئێوە شیفایە
خاستر لە شیفای بوو عەلی سینایە شیفاتان
هەرپێ و قەدەمی ئێوە کە پیرۆز و بەرێزە
بۆحاڵی نەخۆش کافی‌یە، ئەکسیرە دمواتان
جوانی قەد و باڵایی کچان زینەتی خشڵە
ڕوو گەردنە هۆی چوونە سەری نرخی تەڵان

ماریفەت و عەقڵ و ئەدەب و عیززەتی نەفسە
بۆتە سەبەبی بەرزی پلەی قەدر و بەهاتان
ڕازێنەرەوەی حوسن و جەماڵ، خشڵی کەماڵە
بەم دووانە وەکوو «شا»ن و لە ئەوجی دەسەڵاتان
وێڵن کە لە شوێن بەختەوەری بیخەنە ژێر پێ
چی ناحەزە وەك پۆزی زل و فیز و هەواتان
ڕابردوو فەرامۆش کەن و داهاتوو بەدی کەن
ژیرانە لە ئاسۆ ببڕن چاوی هیواتان
خۆماڵی بپارێزن و بێگانە فڕێ دەن
جێی لاوی وەتەن بێ دڵی پڕ مێهر و وەفاتان
لاگیری بەرەی لارە مل و دوورە پەرێز بن
پشت گوێ بخەن ئەو تیپە لە ناو کۆشك و قەڵاتان
بۆ چارە سەری دەردی گەل و مافی خوراوی
تەرخانی بکەن کۆشش و هەوڵ و تەقەلاتان
ئەو کاتە زوڵم دەکرێ لە هاو خوێن و ڕەگەزتان
بێ دەنگی پەسن کەن، زلە تاوان و خەتاتان
کێ چاك ونیەت پاکە، لە گەڵ ئەو بە وەفا بن
ئاوقای چەپەڵ و ڕوو ڕەشی کەن تیری جەفاتان [1]
جوانانی پەری ڕوو بە دڵ و گیان بپەرەستن
ئەو شێرە[2] بە جەرگانە لە ناو کۆڕی خەباتان
چی سەروەت و سامان و شتی جوانە، نیانە

---

١-

کێ دۆستی گەلی کوردە، لە گەڵ ئەو بە وەفا بن
ئاوقای جگەری دوژمنی کەن تیری جەفاتان

٢- ئەو ڕۆڵە

جێی مردن و ژینیانە کەژ و کێو و چیاتان
دیو تانە کە دوژمن بە سەدان، بەڵکووهەزاران
ئادەمکوژی مۆڵ داوە لە هەر شار و دێهاتان
هەشت ساڵە نەوێستاوە لە کوشتار و جینایات
کاولکەر و خوێن ڕێژە هەموو وەخت و سەعاتان
زاڵ نەبووە لە سەر هێز و وورەی بەرزی کوڕی کورد
نەیهێشتووە دوژمن وەحەسێ هیچ دەم و کاتان
ئێوەش وەرن [1] ئەی شۆرە کچانی سەقزی بەرز
گیان و لەشی ئەم شاعیرە بێ چاوە فیداتان
خێر خوازی گەلی ژێر دەس و دڵسۆزی وەتەن بن
تا سەر لەگەڵ ئەم شۆڕشە بێ شەرت و بە قاتان [2]
تا هەن لە سەر ئەم زەوی یە لە گەڵ تاقمی زۆردار... [3]
ڕوو تاڵ و ترش بن هەموو دەم تۆبی خوواتان
کێ ناحەزە ئاکاری لەگەڵ ویستی ڕەوامان
بێگانە بو و یا خۆیی، وەکوو سەگ بێ لە لاتان
کێ گورگەلە لە ناو پێسی مەڕا، گورگی بناسن
ماری سرە، هاو ڕازی مەبن هیچ دەم و کاتان
بێگانە لەگەڵ خۆیی بە چاوێکی مەبینن
دۆستانی ڕواڵەت وەکوو دوژمن بێ لە لاتان
زیاتر لە مەسەرتان نەیە شێنم، گوڵەکانم
جێی داخە کە نەمتوانی بکەم مەدح و سەناتان
خوای گەورە بپارێزێ هەموو ئان و زەمانێ

---

١- تۆ خوا وەرن.
٢- گۆرانی بە سەر تانەوەیە قەد شەرت و بە قاتان
٣- تاقمی ناپاک.

ئـێـوەی ڕەسـەن و سـەقـزی خـۆش ئـاوو هـەواتـان
لە زیان وزەرەر، خۆف و خەتەر، تاڵی، موسیبەت
لەو خـوێـن مژە قـەددارە کـەوێ دەرد و بـەڵاتـان[1]
حۆجەم بە دوعای خێرە کە چەن ساڵە نەخۆشم
چـون ئـێـوە نـفـووس پـاکـن و گـیـرایـە نزاتـان
بۆم دەس بە دوعا بن، لە خـوای گـەورە وەپـارێـن
لێم ڕوونە شـفـای دەردی لـەشم دێ بە دوعـاتـان
نـازداری سـەقـز ئـەم غـەزەڵـە تـازە لـە بـەر کـەن
بـۆبـیـرەوەری، بـەڵـکـوو بـمـێـنـێـتـەوە لاتـان.

١٨ی پووشپەڕی ١٣٦٦

---

١ - لەو غەیرە پەرستانە کەوێ دەرد و بەڵاتان.

# مهین جون

ای سرو قدت چوبه‌ی اعدام، مهین جون!
خال سیهت دانه و هم دام، مهین جون
ما تیك لبت زانکه به خون سخت شبیه است
می‌مانی به جلاد خون آشام، مهین جون
در محبت چاه ز نخت هر که در افتاد
از وی اثری نیست به جز نام، مهین جون
مردان دلیراَند اسیران کمنداَت
شیران مهیب‌اند تو را رام، مهین جون
با آتش رگبار نگاهت چه توان کرد
جز کشته شدن عاشق ناکام، مهین جون
آن دسته ز عشاق که در بند کشیدی
محکوم به مرگ‌اند سرانجام، مهین جون
جایی که در احکام تو تجدید نظر نیست
ما را چه امید است به فرجام، مهین جون
با این همه تشدید ستم باز نگیریم
ما دل شدگان بی رخت آرام، مهین جون
قهر تو صفا، خشم: وفا، نیش تو نوش است
شهد است مرا زهر تو در کام، مهین جون
چشمان می آلود تو را شیخ ببیند
سجاده نهد در گرو جام، مهین جون

تابستان ٥٤

١٣٣٧ دیاری



## برای هاوپشتی یەکتر بین

سڵاو بۆ خاکی کوردستان و خەڵکی ژیر و هوشیاری زیت
سڵاو بۆ کوردەواری، بۆ تەواوی ئەهلی دێ و شاری
سڵاو بو نیشتمانی جوان و شاخی بەرز و بەفرینی
سڵاو بۆ بەندەنی بژوێن و کانی ساف و سازگاری
سڵاو بۆ قەڵبەزەی ئاوی، کەلان و ڕژد و هەڵدێری
لە بنیا زیخ و چەو دەنوێنێ وەك یاقووتی مرواری
سڵاو بۆ دیمەنی بەرزی چیای زەنوێری سەر سەوزی
سڵاو بۆ شیو و دۆڵ و ڕستە چاڵ و کیژی مەڕداری دۆڵ
سڵاو بۆ گشت دەر و دەشتی، بەهەشتی گەشت و سەیرانە
سڵاو بۆ خور خوری ڕووبار و مێرگ و چیمەن و داری
سڵاو بۆ کۆمەڵانی خەڵکی زەحمەت کێش و ئارەق ڕێژ
سڵاوی تایبەتی بۆ چینی هوشیار و کرێکاری
سڵاو بۆ ئەو برا وەرزێرە وا جەرگی زەوی دەدڕێ
هەتا ژینی مە دابین کا لە داهاتی زەوی‌وزاری
سڵاو بۆ ئەو برا دروێنەوانەی تاکوو شەو دادێ
لەگەڵ چەرخ و مەڵۆو داسی مەڵەغانە سەروکاری
سڵاو بۆ ئەو کەسەی شەتڵانی ئارەق بوو لە مەزرایە
دەم و لێو وشك و چاو پڕ بوو، پەڕیوە ڕەنگی ڕوخساری
سڵاو بۆ ئەو کەسەی هێند ماندووە و کوێرە وەری زۆرە
شەوێ نانوێ لە تاوی ژان و تیژ و ئیش و ئازاری
سڵاو بۆ ئەو کەسەی کاری بژارە و دەسکەنە و بنکۆڵ
گەلێ ماقوولترە دەست و پلی هەڵچین و زاماری
لە دەستی ناسك و نەرم و سکی بێکارە و تەمبەڵ
لە سەر خەڵکی بەرێ دەچن و دەخۆن نانی منەتباری
سڵاو بۆ ئەو کەسەی دەیژێنێ منداڵی بە فەعلایی

به هێزی دەست بژیو پەیدا دەکا، پێی شەرمە بێکاری
سڵاو بۆئەو کەسانەش بێ دەبرژێن تا دەبرژێنن
هەموو دەم نانی گوڵ پەرشە و بەهار و گەنمە سەرداری
سڵاو بۆئەو کەسەی دیدە و مەرامی خزمەتی خەڵکە
هەمیشە یارمەتی داماو ولێ قەوماوە ئاکاری
سڵاو بۆئەو کەسەی ژینی بەخت کا بۆگەل و هۆزی
هەتاکوو دوا هەناسەی سەرنەدا ڕێبازی ڕزگاری
سڵاو بۆلاوی ڕۆشبیو و گەنجانی بەدین و ژیر
سڵاو بۆمیللەت و ڕۆڵەی ئەمەگناس و وەفاداری
سڵاو بۆڕاپەڕین و شۆڕشی ئازادی خوازانە
سڵاو بو قودرەت و هێزێك نفووزکا کۆشکی زۆرداری
سڵاو بۆئەو شەهیدانەی کە خۆیان کردە قوربانی
لە ڕێی ئامانجی بەرزا بوونە سەر مەشقی فیداکاری
سڵاو بۆنووسەران و هۆنەری دڵسۆز و تێ کۆشەر
سڵاو بۆڕێبەرانی ڕاستەقینە و چینی خۆینکاری
سڵاو بۆ تاقمی پێشڕەو، بەرەی ڕزگاریخوازی کورد
کەوا هێرش دەبەن بۆسەر نیزامی زوڵم و ژێر باری
سڵاو بۆکۆشش و هەوڵ و خەباتی خەڵکی چەوساوە
لە دژ یاسا و ڕژێمی ناهەق و جەور و ستەمکاری
سڵاو بۆئیتیحاد و یەکیەتی گشت کۆمەڵانی خەڵك
لە مامۆستا و قوتابی تاکوو کاسبکار و بازاڕی
سڵاو بۆپێشەوای دینی کە ڕێنیشاندەری خەڵکە
بە مەرجێ کردەوەی یەك بێ، لەگەڵ تیژبینی گوفتاری
سڵاو بۆئەو کەسەی ڕاس و نیەت پاکە لەگەڵ خەڵکی
بە موو تێیدا نیە پێچ و پەنا، دەرناکەوێ خواری
سڵاو بۆئەو کەسەی جێی باوەڕو متمانەیە بۆگەل

بە سوودی میللەتی کورد و گەلانە تەرزی ئەفکاری
سڵاوم هەرچی بوو پێشکەش بە ئێوەی خۆشەویستم کرد
لەمەڕ خۆمانەوە وەچەن مەتەڵەبێکم دێتە سەر زاری
تکاکارم لە خەڵکی شار و لادێکانی کوردستان
لە گوێ مەگرن قسەی کەس با نەزانن چۆنە ئەتواری
کەسێ ئیمڕۆ قسەی خۆشە، ئەگەر عەیبی بوو مەیپۆشە
دەبێ ڕوون بێتەوە دۆینێ چلۆن بوو ژین و ڕەفتاری
گەلێ هەن وەك برایەك دێن و دەدوێنن بە دڵسوزی
بەڵام مەعلووم ئەبێ سۆزی کە پێوەی داوی وەك ماری
گەلێك هەن ئێمە دەدوێنن، لە ئەسڵا گێرەشێوێنن
فیدایی و دوو دڵی و ناکۆکیان هێناوە بە دیاری
گەلێکیش هەن کوڕی ڕۆژن، زەمانە ملکەچی کردوون
ئەگۆڕن ڕەنگ و ڕوویان، دێنە ناو کۆمەڵ بە ناچاری
بەڵێ ڕێوی دەغەڵ شێر و پڵنگیشی فریوداوە
بە گفت و لفتی شیرین و بە ڕاوێژی دەم و زاری
لە سەرمان یەکیەتی فەرزە، دەبێ تێکرا بەجێی بێنین
دەبێ پشت و پەنای یەك بین و بگرین دەستی هاوکاری
برای هاوپشتی یەکتر بین، هەتا بێگانە نەتوانێ
بخاتە نێو چەکی ئێمە کەلێنی قین و لاساری
برایەك تازەمان دیبێ، گەلێك پێوستە بیناسین
نەکوو بۆمان بەدی بێنێ ڕەوو جەنجال و نابازی
ئەگەر سەرتان لە هۆنراوەی غەفوور ئێشاوە بمبورن
بە قوربانی گەلی کوردە، بە خۆی و بەیت و ئەشعاری
قسەم هێشتا گەلێ مابوو، مەبەستم زۆر لە دڵدا بوو
بەڵام چبکەم قەڵەم چیدی نەکردم کۆمەك و یاری.

## جوانی سەردەشتی

پێشکەش بە کیژانی چاو شەهێن و دڵ ڕفێن و خەم ڕەوێنی سەردەشت و دەوروبەر

جوانی سەردەشتی بە هەر شێوەیێ خۆ بنوێنن
لە دڵی سارد و سڕا داری ئەوین دەڕوێنن
گورو تینی تەمەنی لاوی تەواو دێتەوە پاڵ
ئەو دەمەی پیری بە ساڵاچوو بە ناز دەدوێنن
خونچەزارن، مەزەدارن، دەم و لێو قەند و پەسەند
شۆخ و ناسک لەش و ڕوومەت گەش و شیرین خوێنن
زەردە خەندێکی ئەوان، هۆی گەشە، مایەی نەشەیە
گیانی کۆست کەوتوو دەبووژێننەوە، هەست بزوێنن
بە بزەی لێو و ئیشارەیەکی برۆ دەتوانن
هەر وەکو بای ڕەشەمە، بەفری خەمان وەتوێنن
جوانی سەردەشتی ئەوی کەوتە کەمینیان، ناژی
دەس بەجێ نێوی لە لیستی شوهەدا وەخوێنن
دیل و یەخسیری ئەوانن کوڕو لاوی سەرمەست
پاکی کەوتوونە کەمەندی کەزی یان، بێ شوێنن
سنگی جوانانە کە دابێژە بە تیری جوانان
ڕەسمی دڵداری یە، کوژراوی ئەوین بی خوێنن
جوان و پیر، کەودەن و ژیر، لورد و فەقیر بانادەن
بەنی جوانان، چ عەوامن، چ ئەوی، دەخوێنن
کامە سۆفی لە خودا ترسە، بە چاوان فێری
چاوە برکێنە دەکەن، نوێژ و تەعات دەچوێنن
ئەوی بەرماڵی لە سەر ناو دەگەڕێ، چاو مەستان
لێفەکەی پێ دەبەنە مەیکەدە، لێ ی دەنوێنن
بەرقی کوڵم و چەنەیان، سستی دەکا شێری ژیان

خەوی کەروێشکی بە سەر دادێ، بە چاو بیدوێنن
جوانی سەردەشتی دەڵێی حۆری بە دەم داینــاون
نرخی هەرکام بە تمەن زۆر لە سەرووی ملوێنن
وەکوو بیستوومە فریشتەی ئەدەب و ئەخلاقن
حافزی گەنجی حەیا و شەرمن و پاك داوێنن
چاو گەلاوێژ و گڕاوێژ و پەری ڕووخسارن
ڕوومەت و سینە وەکوو ئاوێنە باڵانوێنن
هێندە ئەسڵ و ڕەسەنن، لای هەموو دنیا پەسەنن
مەند و شیرین دەهەنن، دوور لە گەزارە و جوێنن
جوانی سەردەشتی پلەی بەرزە لە عەقڵا، گشتی
شارەزا و زیرەك و زانا بە هەموو ڕێ و شوێنن
سەرەڕای جوانی فریشتەی ئەدەب و ئەخلاقن
حافیزی گەنجی حەیا و شەرمن و پاك داوێنن
جوانیان تێکەڵی بەرزی شەرەف و ئابڕووە
خۆلە بەد ناوی دەپارێزن و دڵ خاوێنن
جوانی سەردەشتی سەحەت سووك و گرانقەدر و بەهان
مەڵهەمن بۆ دڵی زامدار و خەفەت تاوێنن
کەس لە دیدار و قسەی خۆشی ئەوان تێر نەبووە
بۆوەزن سووکی دەڵێی ئاوی چەمی لاوێنن
فێری هەڵمشتنی بۆ عەتری چیای زەنوێرن
هۆگری ئاوو هەوای هۆملەکەی بۆوێنن
بسکی جوانان بە شنەی شانە دەکا بای بسکان
بسك و با دەس لە ملن، ڕەنجەڕۆ مل بەکوێنن
شۆرەتی جوانی ئەوان چۆتە هەموو مەڵبەندێ
زکری خێریان دەکەن، ئەو خەڵکە لە لای بیتوێنن
خۆزگە بۆوەی دڵەکەم نەمرێ لە ڕووی عاتیفەوە

بێنە لام تاوێ، گەلی شۆڕە کچان بمدوێنن
چی دەبوو خوایە لە جێی چاو لە دەسی، چاو لە دەمی
خونچە لێوان بکەم، ئەو کاتە کە دەی پشکوێنن
دەمگرێ بەرقی بە سام، توولە نەمام بێنە پەنام
هەروەکوو قافیەکەم، بەندی دڵم دەپسێنن
کوفر و دین، شادی و شین، مردن و ژینیان بەدەسە
جوانی سەردەشتی حەیات بەخشن و گیان ئەستێنن
کچی کورد میرغەزەبن، پاکی لە حاست دوژمنی کورد
بە مڕو مۆچی و ڕووگرژی، دەیان تۆقێنن
دەدڕن ورگی جەفا پیشە بە نێزی ڕق و قین
پشتی داگیرکەری ناکەس بە پەیاخ دەشکێنن
دڵی خۆماڵی دەپشکوێ بە وەفا و مێهری ئەوان
بە سەفا و عاتیفە ئاواتی دڵان پێک دێنن
بێ وره و هێزە لە حاست خونچە دەمان، پیری دەمان
سەری تەسلیم بە تەعزیمەوە دادەنوێنن
فەخر و شانازییە بۆ کامە مەقامی هەرەبەرز
خۆڵە بەرپێی کچە سەردەشتی لە کاوەتلێنن
با برێکیش گلەیی و ڕاز و نیاز بێننە گۆڕ
گەرچی کچ تووڕەن و پێم وانیە بیسەلمێنن
دڵ ڕەق و بێ بەزەیین کچ، کەمەکێ جێی گلەیین
پێ گەیان نێو دڵی پووڵدارە و هەزار چەوسێنن
دەستەمۆی سەروەت و سامان و پلە و زێڕ و جلن
کێ کز و مل کەچە، کچ لووتی پێدا ناهێنن
گێژی پووڵدار و خەرەفت، مل هوڕ و دەستە ملانن
مەردی مەیدانی شەرەف، جل شڕ و دڵ بە خوێنن
خوای پلە و پایە لە دیدار، تەسەل و کامڕەوان

ڕووت و بێمایە، لە سوێی یار سەرەتان هەڵدێنن
مادیات، مەعنەویاتی لە جیهان پێ شێل کرد
ژیر و لاگیری لە شێت خانەوە سەر دەردێنن
یا لە لای قازی بە زیندانی ئەبەد مەحکوومن
بێ گومان، یا پەتی سێدارە دەیان خنکێنن
سەر چڵان، سوورە گوڵان، قووتی دڵان، بمبوورن
نسحەت و پەندی سەمیمانە نەتان تۆرێنن
بێت و بەم شاعیرە بێ چاوە بڵێن خەڵفاوە
دیارە حەقتانە، قسەی بێمەزە سەر دێشێنن
مەعزەرەت بۆچی نەخوازم لە کچان، خەڵکی جیهان
ئەوی هەق وێژە، پێیان ناحەزە، دەیبوغزێنن
خاوەنی شمشی تەلا و لیرە، قسەی جێگیرە
مالکی کۆشك و قەلاژیرە، پەنای بۆدێنن
پیاوی بێپارە، وتەی ژارە، چزووی ڕشمارە
قسەیان زۆر ڕەقە، چونکی هەقە، دڵ شەمزێنن

# جێژنی کرێکار

وەرن یاران وەکۆبن، ئیمرۆیەکەم ڕۆژی ئایارە
گەلێ گەورە و بەرێزە، جێژنی مێژوویی کرێکارە
بەچینی کار گەر بێژن کە ئیمرۆنەچنەوە سەر کار
کرێکاری جیهان لەم جەژنەدا سەرپاکی بەشدارە
بکەن یادی شەهیدانی شیکاگۆو شوێنەکانی تر
لە سەر مافی ڕەوا لێتان کرا ئەو زوڵم و کوشتارە
برایانە هەموو جەم بن، لە سەر جادە، بە دەنگی بەرز
تف و لەعنەت بنێرن بۆ ئەوی خوێن ڕێژ و غەددارە
بلەرزێنن بە نرکەی سینە پشتی دێوی چەو سێنەر
بڕووخێنن قەڵات و کۆشکی هەرچی هار و زۆردارە
قومار و ئارەق و ئاسوودەیی خوێنمژ لە چی پێك دێ
هەموو شیرەی لەش و گیانی کرێکاران و جووتیارە
لە سایەی زەحمەت و چەوسانەوەی ئێوە هەتا کەنگێ
وەسەر یەك نی خودای شەڕ، شوومی بەدفەڕ، سەروەت و پارە
لە شان و قۆڵی ماندووتە زکی ئەو پیلە وا تێرە
لە دەست و مستی تۆ گیرفان پڕە زلهۆڵی بێکارە
شەڕی زۆردار و بێ زۆر بەم زووانە دوایی پێ نایە
هەتا مەزڵووم جەفا کێشە، هەتا زاڵم لە سەر کارە
مەحاڵە ئاشتی نێوانی ئەم دوو چینە جیاوازە
یەکێ پشت و پەنای خەڵکە، ئەوی تر زێڕو دۆلارە
پیرۆز بێ جێژنی یازدەی بانەمەڕ، بیرەوەرەی مافە
بە سەر گشت ناهەقا زاڵبوونی هەق لەم جێژنەدا دیارە
لە سەر ئەو باوەڕەم ئاکامی ژینی گەل موساواتە
بەڵام کوا دێتەدی بۆ حافزی داماو و بیچارە.

لەڕۆژی ٢٠ی گەلاوێژی ساڵی ٦٤دا، ستایش لەسەر ویستی حاجی مەلامحەمەدی وەتمانی لە زمانی خۆیەوە هۆنیومەتەوە بەو هیوایە لە ماڵی کابەی شەریفدا بیخوێنێتەوە.

عەبدی عاسی، تۆمە وەتمانی، موحەممەد ناومە
خاکی پیرۆز و بەڕێزی کابە سوورمەی چاومە
بەم هەموو تاوانەوە خۆم خستە قاپی ڕەحمەتت
بەڵکە بمبووری، کەنەفت و مل کەچ و داماومە
خوایە بمبەخشی بە لوتف و مەرحەمەت، چون عەفوی تۆ
هۆی گەشی بۆ گیانی ناشاد و دڵی ژاکاومە
دیلی دەستی نەفسی سەرکێشم، پەنام هێناوە بۆت
چاوەڕێی لوتفم کە ڕزگاری لە بەند و داومە
ئەشکی خوێنین و بڵێسەی ئاهی گەرمی ئاگرین
شاهیدی کلپەی دەروونی پڕ لە جۆش و تاومە
بۆ تەوافی ماڵەکەت هاتووم و هیچم پێ نییە
دەس بە تاڵ و دڵ بە کوڵ، دەم وشک و چاو پڕ ئاومە
هەڵوەدا و وێڵم لە دووی سەرچاوەکەی لا تەقنەتوو
شارەزام کە خوایە زۆر تینوو جگەر سووتاومە
بیکە خاتر خۆشەویستانت، خودای خاوەن کەرەم
لێم ببوورە، پێ بە عسیان و خەتا بەستراومە
هەرچی کردوومن، گشتی لە داوێنم پەڵەن
ئارەقی شەرمم لە ڕوو دەتکێ، خەجاڵەت ماومە
والە کورتیدا تەمەن، بێ کردەوەی مەولا پەسەن
مووی سپی، بەڵگەی دەمی کۆچ کردنی ناکاومە
چون لە ژینمدا دروشمی تاعەت و تەقوا نەبوو
دڵ پەرۆشی عومرەکەی بێ حاسڵ و فەوتاومە
کوردم و هاتوومە دەرکی تۆ، تکا و پاڕانەوەم

بۆ گەلی مەزڵووم و ئاخ هەڵکێش و لێ قەوماوەمە
خۆشەویستانم بپارێزی لە دەردی دڵ تەزێن
بێ بەڵابێ هەرچی دۆست و ئاشنا و ئاسیاوەمە
خاوەنی کابە، ڕجای بەخشینی تاوان و خەتا
بۆ غەفووری دڵ شکاو و عاجز و داماوەمە(١)

١- بۆ غەفووری دڵ شکاوو عاجز و بێ چاوەمە.

-٨٥-

## دیمەنێکی بەهاری

زستانی بەسام و بەدفەڕو هار
زۆر سارد و سڕو بە زوقم و سیخوار
بەفرین و بە بارن و کرێوە
زددی پەلەوەر، نەیاری گیاندار
زستانی دزێو و نەگبەت و شووم
بێ ڕەحم و سەخت، بە نیش و ئازار
پڕ دەردی سەری، بە ئەرك و ئازاب
خوێن تاڵ و عەبووس و قەڵس و لاسار
زستانی بە زبر و زەنگ و تۆسن
نامۆو غەرەزاوی، چەشنی زۆردار
ڕۆژی کەرەسیسە، شەو؛ تەم و مژ
ڕووتاڵ و ترش، بەیان و ئیوار
ماوەی تەمەنی لە کورتی داوە
دوا کۆچی نێزیکە، چەوتی نابار
هاکا دەڵە دێوی نەحسی سەرما
پێچایەوە بار و چۆوە بۆ غار
هاکا بە شنەی شەماڵ و باران
بەفراوی هەرەس ڕژایە جۆبار
هاکا بە پەیامی خاکە لێوە
گەش بوونەوە خەڵکی گوند و نێوشار
نەورۆزی بەرێزی گەل پیرۆز بێ
شاد بین بە بەهار و وەسڵی دیدار
کاڵ و بەتەمەن بچینە سەیران
سەیری دەر و دەشت و چیمەن و دار

دڵ ڕوون کەرەوە و خەفەت پەڕێنە
دەم چۆم و شەپۆڵەکانی ڕووبار
لەو باغ و ڕەزانە سەر هەڵێنی
لەو دیمەنی دڵ ڕفێنی گوڵزار
گوێ هەڵخەنە زەمزەمەی گەلی مەل
شۆریان لە سەرایە هۆزی باڵدار
هەریەك بە هەوایەك و نەوایەك
دەخوێنێ لە مەدحی دڵبەر و یار
زیاتر لە هەمان، لە هەیبەتی گوڵ
ئەسرین دەوەرێنێ بولبولی زار
دەخولێنەوە کیژ و کوڕ لە باغان
پاکی گلەیی دەکەن لە ڕۆژگار
کوژراوی ئەوین و دڵ بریندار
خوێنیان دەتکێ لە قەلبی زامار
کاتی وت و وێژی عاشقانە
دوورن لە زمانی چەوتی شۆفار
لەو لاشەوە کۆڕی بەزمی مەستان
گیراوە بە عوود و نەغمەیی تار
ڕاکێشی سەرنجە چوونی مەزرا
گیان بەخشە ئوحوئوحویی جووتیار
پێم خۆشە دەمێك بچینە لادێ
دووربین لە هەرا و هەنجەمەی شار
تێر بین لە پەنیر و ماست و مەیلە
کوێ شیر و فرۆ و کەرەی عەتردار
بەینێکی بە خۆشی ڕابوێرین
دڵ خاڵی وە بێ لە مەینەت و ژار

ئەوسا کە دەچینە گەشتی کوێستان
بۆ جێیە بەهەشتی لێوە بێ دیار
خەملیوە چیا بە سوور گوڵ و گیا
پۆشیویە هەڵاڵە بووکی کۆسار
مەندۆك و کەماو و هەڵز و بیزا
هەستاوە بڕیویە ڕێ لە ڕێبوار
ڕازانەوە بەرقەدی نواڵان
سەرپاکی بە تاوڵ و چیغی مەڕدار
کیژۆڵە کە دێنە دەر لە ڕەشماڵ
کەزی یان لە دواوە عەینی ڕەشمار
ئەو مێگە لە جوانە لەو قەدانە
دووربن لە نفووس و چاوی بەدکار
هێندە قەڵەو و بەکەیفن، ئێژی
دابستە نەگشتی، بوونە پەروار
خۆش دیمەنە لەو چڕو تەلانە
ژن باوەشە پوشکە دێننەوە خوار
بۆ ئاگری شێو و شیر کوڵاندن
کۆڵوو، بنە گوێنی، زەردە کیفار
خۆشتر لە نەوایی مۆسیقایە
بارەی مەڕو بزن و بەرغەل و کاڕ
هاوێز و زەنازە نای ژن و ژاڵ
نێزیکە بگاتە چەرخی دموار
داوەت دەگرن لە دەوری هۆبە
کیژان و کوڕانی سادە ڕوخسار
بێریانی بە ناز و قۆڵ بە بازن
ڕوومەت گوڵ و چاو شەهێن و بە خومار

ئەم ڕستە درێژە مەیپسێنن
بینێنە سنووقی دڵ بە یادگار
بۆ بیرەوەری بمێنێ لاتان
بمهێننەوە بیر، بەمانە جارجار

## بۆ کوری رەفیقی ئیبراهیمی - ژێر ماشێن کەوتووە.

کاك سیامەندی رەفیق، شەش ساڵ بوو
ژیر و وریا، لە تەمەندا کاڵ بوو
دایك و بابی بەتەما بوون لە بەری
وەحەسێن، ئارەزوویان پامال بوو
دایە بەر چەرخی قەزا، دەستی قەدەر
دەس بەجێ مەرگی بە سەردا زاڵ بوو
ئەم هەواڵە دڵی دۆستانی تەزان
بۆرەفیقانی رەفیق، زۆر تاڵ بوو.

- تا ئێرە بۆ سەرکێڵی شەهیدەکە -

ساڵی شەست و شەشە، مانگی پووشپەڕ
خەڵکی سەردەشتی هەژار و بێ زەڕ
لە ژن و پیاو و منال، بگرە، هەتا
لاو و کیژی گەش و گەنجانی بەفەر
یەکدڵ و گیان دەژیان، لەو شارە
بێ قرە و گێچەڵ و ناکۆکی و گەڕ
هێزی شووم و چەپەڵی زۆرداران
دێوی ئاسمانی بەسام و بەدفەڕ
تێکی پێچانەوە بێ سووچ و خەتا
زۆر بەیان خستنە ناو ئاگری شەڕ
گوڵی باغی تەمەنی چەن بنەماڵ
بەدەسی کورد کوژەکان بوو پەڕپەڕ
بە ملنی کێیە وەبال و دەینی
گەلێ ئینسانی شەریف و لاشەڕ
بۆچیان خستنە پێچاڵی مەرگ
بۆهەموو قالبی جنێن وەك جەنجەڕ

کەس نییە بێژێ بە خاو پیرز دیکۆیار
بنەڕێنێ بە سەری دا، وەکوو کەر
بۆچی تۆدادی گەلان ناپرسی
دێو دەیانخاتە تەنوور، وشك و تەڕ
دەس درێژ بۆ بەسزا ناگەیەنی
بۆ گەرووی ناکوشی دێوەزمەی شەڕ
تا لە سایەی تەقەلا و کۆششی تۆ
ئاو لەیەك جۆگەوە خۆن گورگ و مەڕ.[1]

---

١ - ئەم شیعرە پات کراوەتەوە.

# جێژن دەکەم

پێنج خشتەکی -ساڵی ١٣٥١

مردن و مانم لە ڕێی سەربەستیا تەرخان ئەکەم
خۆ فیدای ئامانجی بەرزی خەڵکی بێ سامان ئەکەم
چاو لە ڕێ و شوێنی سمایل و زەنگەنە و پوویان ئەکەم
بۆ گەل و خۆشی وڵاتم، گیان و لەش قوربان ئەکەم
خوێنی گەش پێشکەش بە خاکی نیشتمانی جوان ئەکەم.

خەڵفی ئازادی لە جێ خوێنی شەهیدانا دەنێم
خۆشەویستانم لە پێناوی گەلی ئازا دەنێم
مۆری سەرشۆڕی بە نێوچاوانی دوژمندا دەنێم
سەر لە ڕێی ڕزگاری خەڵکی ڕووت و برسی دادەنێم
ژین و سامانم قەزاگێڕ و بەلاگەردان ئەکەم.

شەرتە قۆڵ هەڵکەم دژی دەربار و چڵکاوخۆرەکان
زۆڵەمل پەت کەم لە مەیدانا، بە تۆڵەی ڕۆڵەکان
قۆڵی شۆڕشگێڕی هەڵماڵم لە زوحساکی زەمان
چاکی بێباکی بە لادا کەم خەباتی بێوچان
تا بژیم بۆ سەربەخۆیی کورد و کوردستانەکەم.

ڕێنك دەخەم هێزێك لەوانەی باب و کوڕیان لێ کوژان
ئاگری شەڕ هەڵدەگرسێنم لە گشت کێو و کەژان
هەڵمەتی تێکڕا دەبەم بۆ سەر قەلاو پێگەی دژان
پێکی دێنم شۆڕشێکی ئاگرین بۆ خوێن مژان
گەورە تا چووکیان لە گڵپەی ئاگرا بریان ئەکەم.

ئەی کرێکار و فەلای خاوەن شەرەف، تێکۆشەران
ئەی ئەوانەی دیل و داماون، بە دەس چە و سێنەران
هەڵگرین تا کەنگێ باری نۆکەری بۆ نۆکەران
دەس دەنە دەستم دەبا هەڵکوتمە سەر داگیرکەران

یا سەرم ئەکرێ بە دارا، یا قەڵا چۆیان ئەکەم.
کامە پیاوی زۆر بە وەزمان بوو، لە بەندیدا ڕزا
یا بە گوللەی گەرمەوە، مێشکی پژا، هەستی چزا
پشتی من بگرن، لێیان دەستێنمەوە تۆڵە و جەزا
توندترین هێرش دەبەم بۆ ئەژدەهاکی بێ ڕەزا
کۆشکی زۆرداری بە سەردا کاول و وێران ئەکەم.
ئەو لە عینانەی کەبوونە هۆی ژیانی تاڵی خەڵك
بێ ئەوەی تۆزێ بەزەییان بێ بە حاڵ و باڵی خەڵك
زۆر و کەم گوێ نادەنە هاوار و ناڵە ناڵی خەڵك
ئەو سەگ و گورگانەوا بەربوونە گیان و ماڵی خەڵك
یەك بە یەکیان دێنە ژێر داری سزا، پەتیان ئەکەم.
ئەو حەرامزادانەوا فتوای تەناب و دار ئەدەن
یارمەتی یاسا و ڕژێمی نارەوای زۆردار ئەدەن
جەزرەبەی منداڵی خەڵکی مات و ئازیەت بار ئەدەن
ئەو دڕندانەی لە بەندا ڕۆڵەکان ئازار ئەدەن
هەر لەبەر پێی دایکە زگ سووتاوەکان وردیان ئەکەم.
خۆفرۆشانێ کەواهەن لەم وڵاتە جوانەدا
گەورەتر زەربە و زەرەریان لەم گەل و نیشتمانەدا
بەو زووانە خەنجەری تۆڵە خۆیان نیشان ئەدا
خائینانی گەل کە هاودەستن لە گەڵ بێگانەدا
لەو زبڵخانەی هەراوی مێژووا گۆڕیان ئەکەم.
ئەو چنۆکانەی کە دایم سوور و ساتی من دەخۆن
بەرهەم و ڕەنجی هەموو شار و دێهاتی من دەخۆن
زۆری پێ ناچێ کە سەر نێزەی خەباتی من دەخۆن
تاقمی جەردە کە سامانی وڵاتی من دەخۆن
پشتیوانم هێزی گەل بێ، هەر بە شەق دەریان ئەکەم.

جا براکان، جێژنەکەم چون جێژنی ڕزگاری گەلە دیارە پێویستی بە کار و سات و ڕێکەوت و هەلە بۆئەوەی زوو سەر کەوم من لەم کەلە، ناکەم پەلە کاتێ تۆڵەم سەند و دامرکا کۆم ئەوحەلە جێژنی سەر بەستی بە سەر بەرزی هەموو کوردان ئەکەم.

# سوپاس بۆ مەهاباد

لە سەعاتی ١٢ ی شەوی ٨ی خەزەڵوەری ساڵی ٥٣دا، زیاتر لە هەزار کەس، لە برا کوردە هەڵخەڵەتاو و لێ قەوماوەکانی عێراق، بێ ئەوەی لە پێشدا بە کەس رابگەیەنرێ، لە نەکاو هاتنە ئەم شارە. دەوڵەت لە دابین کردن و بەخێو کردنی ئەوان عاجز بوو. ناچار بە هۆی تلۆیزیۆنەوە بە خەڵکی رایگەیاند کە کۆمەك بکەن. لەو شەوە درەنگ و وەختەدا کۆمەکێکیان پێکرا و خزمەتێکیان کرا کە مێژوو دەبێ هەتایە شانازی پێوە بکا. منیش بەو بۆنەیەوە، ئەم پارچە پێنج خشتەکیەم هۆینوەتەوە بە ناوی سوپاس بۆ مەهاباد، بە بۆنەی یارمەتی خەڵکی لێقەوماو و ناشاد:

(١) کانگەی شەرەف و غیرەت و ویجدانە مەهاباد
چاوگەی کەرەم و هیممەتی مەردانە مەهاباد
جێی حورمەت و رێز گرتنی میوانە مەهاباد
بوو ژێنەرەوەی رووت و هەژارانە مەهاباد
ئامادەیی خزمەت بە غەریبانە مەهاباد

(٢) سابلاغی لە رێی پیاوەتیا قەدنییە ترسی
کامی لە سەرە، بێت و لە ئاکاری بپرسی
وەك حاتەمە، ئەو کاتە خەڵك کەوتەمە ترسی
بۆ یارمەتی داماو و تەسەل کردنی برسی
رازێنەرەوەی خوانە، قەدرزانە مەهاباد.

(٣) کێ بەرەحم و رەنجی لە بەین بردووە لاقاو
کێ ماڵی هەموو ئاگری تێبەربوو لە ناکاو
هاواری بگاتە گەلی ئەم شارە بە پرتاو
بۆی دێ لە جل و بەرگەوە تا پارە بە لێشاو
رزگاری دەکا فەوری لە تەنگانە مەهاباد.

(٤) سابلاغی سەدی دەی لە خەمی بوون و نەبوونە
باقی دی شەریکی خەمی داماو و زەبوونە

خەڵکێکی نیەت پاکن و بیریان هەموو ڕوونە
ئەم شارە لە بۆکاری بە جێ بۆتە نموونە
تاریفی لە ناو خەڵکی وڵاتانە مەهاباد.

(٥) لێبووردن و ڕەحم و بەزەیی لێرە کە باوە
میراتە لە پێشینەوە بەم خەڵکە براوە
ئازایەتی و غیرەت و هیممەت لە خوداوە
هەستێکە لە پاڵ میللەتی ئەم شارە نراوە
دڵ پاکی و بێ باکی لە خۆی جوانە مەهاباد.

(٦) دڵیان پڕە سابلاغی لە ئیخلاس و ئیرادەت
ڕووخۆش و گەشن، بێ غەرەزن، دوور لە حەسادەت
لایەنگری مزگەوت و ئەویندار[ی] عیبادەت
دینداری و تاعەت چووەتە ئەو پەڕی عادەت
سەرچاوەیی خواناسی و ئیمانە مەهاباد.

(٧) لەم شارە بڕێ کار بە دەسن، خێوی مەعاشن
بیستی لە سەدا خاوەنی سامان و قوماشن
داخم کە بەشی زۆرتری دەس کورت و لە پاشن
بۆدەست و دڵ و خزمەتی خەڵکی هەموو باشن
ئەرکێکی گەلێ قورسی لە سەر شانە مەهاباد.

(٨) دڵسۆزی بەرەی لارەمل و بێدەسەلاتن
یاریدەدەری خەڵکی ڕەش و ڕووتی وڵاتن
ئەهلێکی بەشەر دۆست و بە بەخشێن و خەلاتن
لای گشتی لە مەیدانی کەرەم، شەرمە هەلاتن
چون مەرکەزی دەس گرتن و ئیحسانە مەهاباد.

(٩) کەمیان لە خەمی سەروەت و زۆر کردنی ماڵن
زۆربەی تەشیەی مەعریفەت و کەسبی کەماڵن
لاگیری هەقن، دژ بە خەرافات و بە تاڵن

لێزان و بەبیری، لە قەڵەمدا هەموو قاڵن
لانەی گەلی بیر ڕوون و بزۆزانە مەهاباد.

(١٠) شارێکی چ خۆش دیمەن و جوان و بەحەشیمەت
لاوانی چ خوێن شیرن و پتێوڵ و بڵیمەت
گەنجی هەموو گەنجینەیی هێژاو بە قیمەت
پیرانی پتە و بیرن و بۆ ئێمە غەنیمەت
زانستگەیی پسپۆڕو ئەدیبانە مەهاباد.

(١١) من لێرە کەسێکم کە دەزانن هەموو ناوم
سی ساڵە لە ناو میللەتی ئەم شارە ژیاوم
بیرم بە ڕواڵەت؛ چل و نۆ ساڵە تەواوم
پێموایە لە سایەی سەری دۆستانەوە لاوم
خۆشی بەگەلی هاوەڵ و دۆستانە مەهاباد.

# بانگەوازێك بۆ گەلی کورد

لە ساڵی ٥٨ی زایینیدا هۆنیومەتەوە. سەرەتای شۆڕشی ١٤ی تەمووزی عێراق.

کوردینە وەرن پێکەوە پەیمانێ ببەستین
بێگانە فرێ دەین و ئیتر بوت نەپەرستین
زنجیری ئەسارەت بە هەموومان بپسێنین
دەس دەینە دەسی یەکتر و مەردانە هەڵستین
یەك هەڵمەتی شێرانە بەرین بۆ بتی گەورە
خۆی و دەس و پێوەندی لە ئەستۆی سەگی بەستین
هەر شۆڕشە ئەمڕۆکە لە سەر تا سەری دنیا
هەر میللەتە پیرۆز دەبن و ئێمە شکستین
هەر مافە لە زۆرداری بە زۆری دەستێنین
هەر ئێمە وەها تەمبەڵ و بێ هیممەت و سستین
ئەو خەڵکە لە چاو ئێمە مەگەر ئاسنە لەشیان
یا ئێمە لە چاو ئەوعی بەشەر بێ دەس و مستین
ئێمەش لەگەڵ ئەو عالەمە وا چاکە هەوڵ دەین
چونکی هەموو دارای یەك ئامانج و مەبەستین
گۆی ڕانەگرین بۆ مەسەلەی حیز و سلامەت
زیاتر لەوە بێ غیرەتی یە ئێمە بوێستین
شەوگاری نەهاتی کەمی ماوە سپەری بێ
کوردینە وەرن، تۆبی خودا لەم خەوە هەستین
ئیقدامێ بکەین هەرچی زووە، با لەوە تەنمان
ئاوارە نەبین هەر وەکوو ئەعرابی فەلەستین
ناو بانگی هەبوو غیرەتی ئێمە لە هەموو جێ
باعیس چی یە وا ئێستە کە بێ جوولە و هەستین.

# لەبی رازدار

پارچە شیعرێکی فارسییە یەکێ لە پیاوە گەورەکان لە زیندانا هۆنیویەتەوە. لەم شیعرەدا خەڵکی هان داوە بە تایبەت زیندانیانی سیاسی، کە هەرگیز ئیعتیراف نەکەن و ڕاستی بە دوژمن نەڵێن. وا منیش وەرمگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی بە ناوی: «لێوی ئەمیندار»

بشکێنە داری جەزرەبە، ئێسکی لەشم هەموو
تێکی کەوە بە جارێ، شەویلکە و ددانی من
هەرچەندی بمچەمێنی لە ژێر باری ئێش و ئۆف
نابیسی ڕاستی لە من و هاوەڵانی من
بمکووژی ئەستەمە کە بدرکێ قسەم لە لێو
مەرجی لە گەڵ ژیانە، دەمی بێ زمانی من
ئەو لێوە ماچی کردووە بەیداغی قینی خەڵك
قەمچی جەفا نهێنی چلۆن پێ دەخاتە ڕوو
لێم نابیسی تەنانەتی پاڕانەوە و تکا
نانێم ددان بە ڕاستیا تاکوو دواپشوو
ماتی بە سەر دوو لێوی منا زاڵە بەردەوام
ئەو ڕۆژە دێتەوە قسە، گەل ڕاپەڕن هەموو
لێم دوور کەوە، فریوی دەغەڵ، چیدی پێم مەڵێ
تا کەی دەچێژی ژەهری سزادان و چەرمە سەر
گەر جارزی لە دەستی لێدان و هەڵاوەسین
ڕاستی کوتن لە بەندی گرانت دەخاتە دەر
ئامێزی دایك و بابە، بە تام تر لە ئاوی ژین
زەردە خەنەی منداڵە، لە دڵ دەردەکا کە سەر
تێپەڕبە ئەی فریوی درۆزن، لە من گەڕێ
ئەو پەردە لادە، ماکی گزی و نادروستییە
جێی کۆشی دایك و باوەشی باوك نییە کەسێ

نوقمی زەلی خیانەت و لیتاوی پەستی یە
مستی ددان شکێنی شیایە، لەباتی ماچ
ئەو باوکەڕوو ڕەشەی دژی میللەت پەرستی یە
بێ هەست و خوستی سووچە، کە ئازار ئەدەن لەشم
مەرجی گرینگی لاوی نەبەز؛ دەنگ نەکردنە
لێوی منیش کە ئێستا وەها داتەپیوە مات
سەربازی ئەم وەزیفەیە، دەینی لە گەردنە
بێ شێو کە خەڵکی برسی دەنوون، چاوی ڕوونی من
زیت و زەقی هومێدە، کە پیشەی نەخەوتنە
جا ئەی دەمی شکاو و زمانی قفڵ دراو
لێو و لچی شپرزە، کە ئێوەن شەڵاڵی خوێن
بێ دەنگی یە، لە باوەشی خۆیدا بەخێو دەکا
بۆ پاشەڕۆژ، کوڕانی نەبەز، لاوی تۆڵەسێن
دوولەت بە، پڕ لە خوێن مە، بەڵام دڵنیا بە زوو
ئەو ڕۆژەدێ کە دوژمنی گەل پەت لە مل کرێن
سێدارە بە بەژنی بەرزی لە بەر زۆری خەڵک
وەك پشتی پیرەمێردی نەوەد ساڵە دانەوێ
نابێتە هۆی ترس، ئەوە بۆ لاوی کۆڵ نەدەر
ئاڵای خەباتی ئەم گەلە چەوساوە نانەوێ
لاناوە تووڕەیی کە لە ژێر ماتی یا وونە
هاکا وەبەر شەپۆلی کەوت، هەرچی ناتەوێ.

# پارچەیەکی چکۆلەی کۆمەڵایەتی

نەفام و هەرزە ئیژن پیاو بە پارە ژیر و ماقووڵە
ئەمن لام وایە پیاوی پیاو، ئەوی پێی هیچ نەبێ؛ پووڵە
ئەگەر راستت دەوێ، با پێت بڵێم کێ حورمەتی زۆرە
لە لای گەورە و بچووك، جێی باوەڕە،مەحبووب و مەقبووڵە:
کەسێ قازانجی شەخسی خۆی وەلا ناوە لە رێی خەڵکا
بە تەنیا ژینی خۆی ناوێ، بە سوودی گشتی مەشغووڵە
هەڵەی زۆرە ئەوەی بۆ ماڵی دنیا شێت و عەوداڵە
لە پێناو کۆشك و پارەی ناوە ئەم حەوڵ و جم و جۆڵە
ئەگەر دارێك بە پیری بچەمینی، رەنگە بیشکێنی
بەڵام هەرچۆنێ مەیلت لێبوو، دای دێنی هەتا شووڵە
مەلەی گۆمی سیاسەت حەستەمە، حافز، مەچۆ نێوی
محاڵە لێی رەها بی، مەن دەبێ، ئامانە، زۆر قووڵە
بە ئاواتی مولاقاتی کەسێکم، دیارە هەیهاتە
ئەمن لێرە لە کوردستان دەژیم و ئەو لە دزفووڵە

# پێنج خشتەکی

## لەسەر دوو شیعری سەی عەبدولقادری سیادەت

پیاوێکی بەرز و زوبدە، لە سەیدانی موعتەبەر
پسپۆڕی فەننی شیعرە، لەورد بینیا ئەبەر
ئەم فکرە چەندە بیکرە، کە لەو مەغزە دێتە دەر
«چاو گەرچی خۆشەویستە، لە لای خاوەنی نەزەر
نابێ بەبێ بەسیرەتی دڵ، لەززەتی بەسەر.»

ئەو خێوی بیری مووقەڵەش و هەستی پڕ لەنوور
غەوواسی بەحری بینش و ئیدراکی بێ سنوور
بڕوانە ئارەزووی دڵی بێگەردی وەك بلوور
«پێم خۆشە کوێر ببام و بەڵام وەك مەلا غەفوور
ڕۆشن دڵ و ئەدیب بم و خۆش زەوق و پڕهونەر.»

# کەروێشکی دڵ

## حەوت خشتەکی لەسەر پارچەیەك لە شیعرەکانی حاجی سەی جەمیل

لە موخلیس بۆچی ناپرسی، کە سامان دارە، یا لاتە
بە حاستەم ئاوڕێکی تۆم لە لا سامان و داهاتە
مڕو مۆچی تە بۆمن، ئەوپەڕی تاڵی و بەسەرهاتە
سەرم وەك پەردەبازی ڕێ، لەسەر پێڵاوەکەی پاتە
وزەی سەرما وڕەی بردم، کە خۆم نایەم، دڵم لاتە
«چ زستانێکی سەخت و نالەبار و پڕ لە ئافاتە
وچانێکم لە دەست جەوری بە دڵ ئامانج و ئاواتە.»
ئەوەی شێخێك بەرازی بۆی بەخێو کرد و بووە شوانی
ئەوەی شێتێك لە لووتکەی شاخی دەرچوو، گیانی بۆ ژوانی
ئەوەی کۆکەن سەری دانا، لە پێناو هیچ نەیتوانی
سەری هەڵبێ لە حاستی مانگی رووت، ئەی مۆعجیزەی جوانی
هەوای ساف و بەتین و تیشکی رۆژی بێت و بڕوانی
وەکوو مەیلت لە من ساردە، وەکوو رووی تۆ لە من قاتە
بەڕاستی وەرزی زستان سەردەمێکی تاڵ و ناخۆشە
مەراق و داخ و دیق باوە، گەشی و شادی فەرامۆشە
جریوەی هۆزی مەل نایەتە گوێ، سەرپاکی خامۆشە
لە کن رووت و رەبەن نیشە، لە لای تێر و تەسەل نۆشە
دەماخی سازە راوچی، پۆشتە سەرما و سۆڵی پێ خۆشە
«ئەگەرچی دەشت و دۆڵ و کێو و کەژ بەفر و سپی پۆشە
بەڵام بۆ ڕاوکەری ئازا و بەهێز و گوڕ هەل و کاتە.»
لەباتی خێر و خۆشی و رووپیشاندانێك لە لایەن تۆ
کەساسی و نامورادی بوو نەسیبم ئەی کەزی شەوبۆ
هیوای خۆشبەختی تاوێری فیراقت داویەتە بەر خۆ

دەترسم ئارەزوو و ئاواتی وەسڵت بەرمە ناو گڵکۆ
لە ژێر باری گرانی ماتەمت دامام دەسەو ئەژنۆ
لە ترسی هەوهەوی راوچی خەمت، کەروێشکی دڵ ئەمرۆ
لەلانی سینە چاوی زیتە، گوێی قووت کردووە و ماتە.»

لە کوێی یاری بەڕێز، دەستی هومێدی مەت بە داوێنی
سەرێکمان لێ هەڵێنی، هەرچی زووتر، زوو نەخاوێنی
مەگەر ئاورێکی خێرت گیانی ناشادم وەهاوڕێنی
دەمی قەندت دەمێ کۆرپەی دڵی هارم بلاوێنی
بزەی گەرم و بەزت، بەفری خەمانم بۆوەتاوێنی
«خەوم ئاڵۆزە وەك پرچت، خەیاڵم هەر دەڕاوێنی
بە یادی تۆوە پێم وایە بە هیوای بەژن و بالاتە»

غەفوور تۆ چونکی ئامانجی رەهێڵەی جەوری ئەم چەرخەی
دڵ و گیانت، هەموو ژیانت لەبەر پێی یاری قەشمەرخەی
سەری پرشۆڕو سەوداشت لەژێر پاپۆشی دڵبەرخەی
وەکوو دیل خۆلە بن دیوار و دەرکی حەوشەکەی وەرخەی
محاڵە نەرمی کەی، رووی پێ لە ژێر هەوری پەتەی دەرخەی
«جەمیل پێت وانەبێ زستانی دڵداری لە پشت سەرخەی
بەهاری وەسڵی یار بۆپیاوی وەك تۆ دوورە، هەیهاتە.»

# خودا تۆبە

هەشت خشتەکی، لەسەر پارچەشیعرێکی حاجی جەمیل هاشمی

هەتا ئەستۆ لە نێو زەلکاوی عیسیانم، خودا تۆبە
وەها نوقمی خەتام، نێزیکە خنکانم، خودا تۆبە
برستی لێ بڕیم باری گوناهانم، خودا تۆبە
هەڵەی سووچ و هەڵەم گرتوویە دامانم، خودا تۆبە
گوناهم بۆتە هۆی ژەنگی دڵ و گیانم، خودا تۆبە
زەلیل و دیلی دەستی نەفسی نادانم، خودا تۆبە
«ئەسیری بەندیخانە و داوی شەیتانم، خودا تۆبە
بەداوێنی بەزەی تۆ، دەستی ئامانم، خودا تۆبە.»
بەخێر و ناسلامەت، ئێمە لای خۆقاری قورئانین
هەواداری ئەحادیسی نەبی و ئایاتی رەحمانین
لە کن خۆلاگری دینی خودا و ئەحکام و ئەرکانین
کەچی یەکدەم لە بیری تاعەتی یەزدان و تەقوا نین
بەڵی بە درۆموسوڵمانین، موتیعی نەفس و شەیتانین
لەباتی بۆعیبادەت تێبکۆشین، تاکوو دەتوانین
«لەجێگەی زیکر و فیکر و نوێژ و رۆژوو، خۆبەکەم زانین
دزێو و چاو نەزێر و خۆبەزل زانم، خودا تۆبە.»
لە خوار و خێچی بیر و را و بەدی ئەخلاق و رەفتارم
لە ناڕاست و دروستی قەول و فێعل و پەستی ئەتوارم
لە ئیشی ناڕەوا و ئیدەی دزێو و چەوتی ئەفکارم
لە ناپاکی دەروون و نییەت و نیشی پڕئازارم
لە سستی تاعەت و لەجبازی قەلبی قەڵب و لاسارم
لە نافەرمانی تۆو جواب دانەوەی نەفسی ریاکارم
«لە هات و چۆو قسە و باسی خراب و کاری نابارم

پەشیمانم، پەشیمانم، پەشیمانم، خودا تۆبە.»

لەبەر پێی نەفسی شوومم نا، شعوور و عەقڵی بێدارم
لە ژێر فەرمانی ئەودایە، هەموو کردار و گوفتارم
لە تەرکی ئەمری باری، باری کردم، خۆشی سەربارم
ئەسب بۆ کوێ بە ئاژووم نەفس و شەیتانن، جڵەودارم
پەنا بۆ کێ بەرم یارەب، لە تۆبەولاوە کوا یارم؟
بەپێی کردەم لەگەڵ وەبزووی، لە قەهرت نابێ رزگارم
«هەتا ئێستا هەڵمهاوێشتووە کۆگایی ئاکارم
کەچی هەر کایە دەسکەوتی شەنە و شانم، خودا تۆبە.»

بەخاتر شای مەدینە و ماڵی پیرۆزی مەکەت، یارەب
بەبێ‌مەرز و حەدی مێهر و هەراوی لوتفەکەت، یارەب
بگە فریای منی بێ‌سانەوە و ماندوو و شەکەت، یارەب
لە ژێر مۆتەی بەسامی ژین، ببم هاکا شەکەت، یارەب
لە ئوقیانووسی ئێحسان و شەپۆلی فەیزەکەت، یارەب
بە لێشاوی کەرەم کە پێ بژیوی بەندەکەت، یارەب
«ئەگەر بێت و شنەی بێنێ، شەماڵی روحمەکەت، یارەب
لە کۆتەڵ دێتە دەر یەکجاری خەرمانم، خودا تۆبە.»

بە چی دەمدا فریو نەفسم، دەلێ پسپۆڕ و چازانی
نەشەی زەوقی ئەدەبدۆستان و چینی وێژەوانانی
شەمی بەزمی هونەرمەندان و کۆڕی نوکتەدانانی
لە سایەی شیعری ئاودارت، پەسندی پیر و جوانانی
ئەدی بۆناڵێ شاعیر تێ‌شکا، کەس ناگرێ لانی
ئەدی بۆناڵێ زۆربەی تیر و پڕ نەژیاوە، کوا نانی؟
«هەتا کەی نەفسی شووم پێم بڵێ تۆ خانی خانانی
دەلێم خۆت لێ نەگۆڕێ، تۆزی بانانم، خودا تۆبە.»

بە داوی نەفسی سەرکێشم، گرفتارم، کەنەفت و دیل

ئەوەی ویژدان و دین بێزارە لێ ی، ئەو پێم دەکاتە تەحمیل
لە شانم بارە، بارستایی تاوانم بە قەد قەندیل
لە ژێر باری گوناهانم، جەدەو بوو پشت و شان و پیل
بە تان و پۆی سپی چۆنی وەشێرم رووی رەشم وەك قیل
بە هیوای چوونی بالا، سەرفی عومرم کرد بە قال و قیل
«لە قالۆری لەشم ئالا، پەڕۆی ریش و کەوا و مەندیل
لە دەس مندالی دلدا بووکی بارانم، خودا تۆبە.»
بە زەللەی نەفس و شەیتانی دەنیدا هەلخلیسکاوم
نەماوە هێز و توانای راپەڕینم، دەست و پێ شکاوم
هیوای هەستانەوەم کوا، تازە تامل نوقمی زەلکاوم
لە نافەرمانی بەو لاوە، نەبوو کردەم، وەتی ژیاوم
گومان ناکەم لە پاش مەرگم، بە باشی کەس ببا ناوم
لە دیوانی جەزادا مل کەچ و سەر شۆڕو داماوم
«ئەوا پڕبۆتەوە سەرچاوە و جۆگەی دل و چاوم
بە دار و بەرد و پووش و خۆلی تاوانم، خودا تۆبە.»
ئەوی دین پێ ی قەبیح بوو، نەفسی بەدفەڕ دایە دەرخواردم
لە تەقوا و تاعەتی کردم، لە خاسانی هەلاواردم
بە هاوڕێ ی ناسپاس و وەسوەسەی خەنناسی ئەسپاردم
ئەوی بێ ئەمری تۆ بوو، پێمی کرد و خۆشی لێ بواردم
بە شاباشی درۆ بوو، رەنجەڕۆ خۆم، بۆ ئەبەد ئاردم
وشك بوو سێبەری ئاواتت و ما ئاهی سڕو ساردم
«کەچی بەو حالەوە هەوری بەزەت بارانی بۆناردم
کە فرمێسکە و بە خوڕ دەڕژێ لە چاوانم، خودا تۆبە.»
خوام هەر تۆی خودای عالەم، کە پشتیوان و یارم بی
لە هەر دەرد و بەلا و رەنج و موسیبەت ئاگەدارم بی
شفا و دەرمانی زامی دل، تەبیبی حالی زارم بی

به تیشکی نوور و فەیزت، شەمعی گڵکۆی تەنگ و تارم بی
قەڵەم کێشی گوناه و قەول و فیعلی نالەبارم بی
عەتابەخشی لەقا و هەم نیعمەتی دارولقەرارم بی
«دەبێ هەرخۆت بە چاوپۆشین و لوتفت یاری کارم بی
کە نەشکێنم لەگەڵ تۆ عەهد و پەیمانم، خودا تۆبە.» ٨
غەفوور سەد هێندە بیمار و هەژار و خار و مسکین بی
هەتا مردن کەساس و لێو بەبار و مات و غەمگین بی
لە دەرکی بارەگای ئەقدەس، وەپارێ، چاو بە ئەسرین بی
بە هیوای هیچ مەبە تا گوێ بە فەرمانی شەیاتین بی
نییە جوابت مەگەر پێڵاوی پێی پیاوانی ئایین بی
مەگەر خاکی دەری مەردانی تەقوا و تاعەت و دین بی
«جەمیل ڕێت ناکەوێ تۆ سەر بەخۆ داخوازی بەخشین بی
بە هیوای ئاورێکی پیری پیرانم، خودا تۆبە.» ٨

# دوو مژۆڵ

پێنج خشتەکی لەسەر پارچەیەکی مامۆستا کەریم فیدایی

تا راندی هۆش و بیرم، غەڵبەنگی دوو مژۆڵت
شیشەی دڵت شکاندم بە سەنگی دوو مژۆڵت
وادیارە من دەکوژن، تفەنگی دوو مژۆڵت
تێ پەڕبووە لە جەرگم، خەدەنگی دوو مژۆڵت
دووا چۆڕی خوێنی کێشام، سوورەنگی دوو مژۆڵت

بەرقی بزەی نیگارم، گرتمی لە ڕێوە، چبکەم
وەك کەکرە تاڵەزارم، بارم لە لێوە چبکەم؟
لای دڵبەری عەیارم، جوابم جنێوە، چبکەم
دەردم گرانە یارم، حاڵم پەشێوە چبکەم
لە کوێ دڵم وەشێرم لە چەنگی دوو مژۆڵت

هەر بەو گوناحە کوردم، پێت وایە سەر بزێوم
پێت موستەحەقی زەجر و زیندان و دار و چێوم
تۆ تیم لە بەندی زوڵفت، وێڵی نزار و کێوم
ترسام و راچەنی دڵ، هێنیسکی دا لە لێوم
نسێزەم کەدی عەزیزم، بەرەنگی دوو مژۆڵت

ئەبرۆتە قیمەکێش و برژانگە شیشی دڵمە
بزەت کە قووتی رووحە، گرژیتە نیشی دڵمە
ئەوین و جوان پەرستی، ئایین و کیشی دڵمە
چاوت مەی و مژۆڵی بەنگ و حەشیشی دڵمە
مەست و خوماری کردم خۆ بەنگی دوو مژۆڵت

تیشکی جەماڵەکەی تۆ، ئاسۆی پڕ هیوا کرد
دڵ کوڵمە ئاڵەکەی تۆ، زامی هەموو دەوا کرد

بیر وردەخاڵەکەی تۆ، وردبینی شارەزا کرد
بۆچاوەکاڵەکەی تۆ، کاتێ دەبوومە شاگرد
زانستی فێری من کرد فەرهەنگی دوو مژۆڵت
ئەوینی ئاگرینت، سووتانی گیانی خەستەم
دڵ کەوتە بەر رەهێڵەی شەست تیری دیق و وەرهەم
چوار دەوری لێ تەنیوم، هێزی قوشوون و ماتەم
شاری دەروونی گرتم، کاتێ بە لەشکری خەم
فەرمانی هێرشی دا، سەرهەنگی دوو مژۆڵت
پلاری چاوکەژاڵم، شکاندی شیشەیی من
دەگرێتە مل وە باڵم، فەوتانی ریشەیی من
گابۆڕە سەگ بە حاڵم، کاری هەمیشەیی من
شەو تا سەحەر دەناڵم، گریانە پیشەیی من
زامی بە ژانە تیری بێدەنگی دوو مژۆڵت
ئاشق کوژی سەوابە، بە بیر و باوەڕی تۆ
پێکانی دڵمە پیشەی پەیکانی تیژپەڕی تۆ
حافز ورەی بەهێزە بۆ مەعرەکە و گەڕی تۆ
وەك رۆستەم، فیدایی، وێستاوە بۆ شەڕی تۆ
سنگی مەتاڵە بێ شك بۆ جەنگی دوو مژۆڵت

# زوڵفی تەناف

پێنج خشتەکی لەسەر پارچەیەك لە هەڵبەستەکانی مەلا کەریم فیدایی

نازدارە، فیدای پرچی رەشی وەك حەبەشی تۆم
سووتاوی گڕو شۆقی هەنە و کوڵمی گەشی تۆم
حەیرانی سپی و ناسکی ئەندام و لەشی تۆم
«ئەی دولبەرە! قوربانی برۆو چاوی رەشی تۆم
وەك فیتنەیی خستۆتە عێراق و عەجەم و رۆم.»
ئەو روومەتە ئاڵەت کە گوڵی بولبولی کوردە
بسکت پەتی خنکانی دەماری زلی کوردە
هەر تاڵێ لە مووت پێوەنی قاچ و قولی کوردە
«ئەو زوڵفە کەمەندەت کە تەنافی ملی کوردە
من کورد و بەخت رەش، دە وەرە بیخەرە ئەستۆم.»
کێ تیری بژانگت لە دڵی داوە، شەهیدە
کێ ماری قژی تۆی لە مل ئاڵاوە، شەهیدە
کام کوڕ بە جەفای تۆوە سەری ناوە، شەهیدە
«هەرکەس کە لە مەیدانی تۆ کوژراوە، شەهیدە
بم کووژە، من ئەو شۆرەتە باوێمە سەر خۆم.»
مستی نە تەویستی لە دڵی دەربەدەرم دە
یا تیشە لە ریشەی تەمەنی بێ سەمەرم دە
شمشێری دوو ئەبرۆت لە کەمەر یا لە سەرم دە
«برژانگی وەکوو تیر لە سینە و جگەرم دە
تا بیخەمە ژێر پێت، سەر و کەللەیی وەك گۆم.»
بم کووژە، بەڵام لێوی رقم لێ مەکرۆژە

دڵ هۆگری سینەت بووە، لێی دامەخە کۆژە
ئەگریجە لەسەر کوڵمە دیاردەی شەو رۆژە
«ئەو پەرچەمی شێرت کە لە سەر روومەتی رۆژە
وەك پەرچەمی ئێرانە، وە دەرکەوت لە ئاسۆم.»
بەژنت بووە سێدارە لە تیرە و رەگەزی کورد
تیری نیگەهت خەڵکی گەلێ کوشت و لەناو برد
خنجێری مژۆڵت لە جگەر دام و لەتی کرد
«شێرت بە بڕۆی شیر، دڵی کوردی دەکا ورد
رۆژت بە حەرارەت بوو، بڕی هێز لە ئەژنۆم.»
بەستی دەس و پێم، تاڵی قژ و پەرچەمی خاوت
تاساندی سەرم، هۆشی بڕیم سیلەیی چاوت
برژاندی دڵم، تینی ئەوینی لە ئەکاوت
«سووتا لەش و ئەعزام، لە تاوت، بە هەتاوت
عالەم هەموو بێزارە لەبەر دووکەڵ و بۆسۆم.»
گورچووبڕە مستت، دەشکێنێ کەمەری کورد
زللەت بە گوڕو هێزە، دەتاسێنێ سەری کورد
پەیکانی موژەت کردی کونا سی و جگەری کورد
«چاڵی چەنەکەت بۆتە بە قەسری قەجەری کورد
گرتووم و بێ سوودە دووسەد شیوەن و رۆڕۆم.»
ئەی شۆخی جەفاپیشەی لەش ناسك و دڵ رەق
سەودا سەری بەر پێتە سەرم، مەیدەرە بەر شەق
شادی مەکە پێم، دوژمنی بەدکارە و ئەحمەق
«خوێنی نەتەوەت مەمژە نەتۆ، چیدی بە ناهەق
بێ رەحمی یە بالای کوڕی کوردی بکەی کۆم.»
حافز کە تەمای پێتە لە هەرکات و فەسڵ دا
چی هەیبوو لە رێی وەعدەیی دیدار و وەسڵ دا

داخم کە سەفای جەننەتی وەسڵت بە فەسڵدا
«چیدی مەدە ئازاری فیدایی لە ئەسڵدا
هاوخوێنتە ئەی یاری دڵ ئارامی سەمەن بۆم.»

# وت و ویژ لەگەڵ بەختی کلۆڵ و خەواڵوو

پێنج خشتەکی لەسەر پارچەیەك لە هەڵبەستەکانی مامۆستا کەریم فیدایی

ئەی پەری سەربەست و ئازا، گەر ئەوی دەیڵێم، هەوی
بۆچی قەد جارێك لە جاران، ڕێت لە ماڵم ناکەوی
دیارە تۆ نووستووی لە گوێی گادا، کش و ماتی خەوی
«ئەی فریشتەی بەخت گرتوو، هەمدەمی ڕۆژ و شەوی
تا بەکەی چاوت لە خەودایە و خەوت لێ ناڕەوی.»
ڕاپەڕە با پێکەوە تەگبیر و ڕاوێژێ بکەین
بیری ڕزگاری لە بەند و داوی خوێن ڕێژێ بکەین
باسی خەڵك و تاقم و چین و هەموو توێژێ بکەین
«هەستە توخوا دابنیشە، با وت و ویژێ بکەین
ماوەیێکی دوو بە دوو بدوێین لە بارەی مەعنەوی.»
ئەی مەلی ئیقبال ئەگەر تۆ ڕوو لە خێر و لاشەڕی
دوژمنێکی ڕاستەقینەی زۆر و تەزویر و زەڕی
گەر لەگەڵ ئەم خەڵکەدا، هاوبیر و هەست و باوەڕی
«من بە کوردی دەتدوێنم لەو خەوەی گەر ڕاپەڕی
مورغە پیرۆزەی لە بۆ کوردی ڕەشید و دڵ قەوی.»
بازی شانازی وەرە، خۆمت لە بن سێبەر بخەم
با لە ژێر سایەت دەمێ کۆرپەی هومێدم وەر بخەم
ناکرێ بێ تۆ لە کەل ئەسپی مورادم سەر بخەم
«با بە وردی باوەڕو بیرم لە بۆ تۆ دەر بخەم
بەڵکوو دەرمانی برینی دڵ لە کن تۆ دەس کەوی.»
من وەتی ژیاوم، دژی شای خۆفرۆش و جەردە بووم
زێدی سەرسەختی ڕژێمی پیسی ئەو نامەردە بووم

گەرچی دایم ژێر چەپۆك و دیل و كۆیلە و بەردە بووم
«چون لە نێو خاك و زەمینی كورددا پەروەردە بووم
مەردم و ناكەم هەتا هەم سەر لە بۆ دوژمن نەوی.»
تا سەفای قەندیلی بەرزی مامە كۆیانم هەبێ
سەیری هەوشین و گەدە و سەرلەندی شێخانم هەبێ
ئاوی سافی هۆمل و چاوگەی كەلی خانم هەبێ
«تاكوو بەفراوی سەری كوێستانی كوردانم هەبێ
نامەوێ یەخچاڵ و قەسر و باڵەخانەی خوسرەوی.»
دڵ بە لووتكەی شاخ و بەندەن، وەك هەڵۆ خووی گرتووە
ژینی قاڵاوم لە لازۆر پەستە، قەد نەمویستووە
روو بە سەربەرزی لە سەر بەرزی ژیانم كردووە
«رووحی كەوبارم كە وا فێری چیاو كەژ بووە
كەی بە ئاوودانەیی دوژمن دەبێ مات و كەوی.»
گەر هەتا مردن فەقیر و بێنەوا و رەنگ زەرد بم
یا وەكوو مەجنوون لە ئەشكەوت و چیا و بن‌بەرد بم
شەرتی پیاوان بێ بە نامەردی نەژیم، هەر مەرد بم
«سەد ئەوەندەی دیكە رووت و قووت و خاوەن دەرد بم
چونكە كوردم، وا دەزانم بوومە سوڵتانی زەوی.»
دەم لە زاراوەی عەجەم بێزارە، مەجبووری دەكەم
دڵ دەڵێ تا هەم لەگەڵ بێگانە ناجووری دەكەم
ماك و ریشەم مادە، چۆن تێكەڵ بە ئاشووری دەكەم
«من زمانێكی پەتی كوردم هەیە و دووری دەكەم
لەو زمانی ئارەب و تورك و زمانی پەهلەوی.»
هەڵوەدای كێو و كەژ و دەمیاڵ و باسكە و باسكم
شێتی چاوبازێكی كەورەفتار و دیمەن ئاسكم
تۆبڵێی بۆم دەس بدا باوێمە ئەستۆی باسكم

«داغداری دوڵبەرێکی شۆخ و شەنگ و ناسکم

٥ دڵپەرێشانم لەبەر کاکۆڵی ڕەشماری ئەوی.»

عیشقی پیری کارەساتێکی بە حافز کردووە

یەك کەڕەت هەست و شعوور و عەقڵ و فامی بردووە

تاو توێی بێمەیلی لێو ئاڵێك نەخۆشی خستووە

«دەردی عێشقی کیژە کوردێ وا فیدایی گرتووە

٥ هەڵدەرزێ، تێك چووە خۆراك و قنیات و خەوی.»

# لەسەر دوو ڕێم

پێنج خشتەکی لەسەر پارچەیەك لە هۆنراوەکانی مامۆستا مەلاکەریم فیدایی

من لە سەر ئەو گوڵە خۆم نوقمی غەم و حەسرەت کەم
یا لە ڕێی ئەم گەلە خۆم تووشی هەزار زەحمەت کەم
دڵ تەماداری وەفا، یا نە جەفا و زیلـلەت کەم
«من دەبێ شین لە بۆ کولمی بە خاڵ و خەت کەم
یا دەبێ شین لە بۆ چارە ڕەشی میللەت کەم.»

من دەبێ گوێ نەدەمێ، هەرچی کە لێمان بەسەرێ
یا دەبێ خۆم بکەم ئامادە لە بۆ هەر خەتەرێ
نابێ چاوم لەوە بێ، دیاری کرا ڕۆژی بەرێ
«من دەبێ داخ و خەمی کورد لە دڵ بەر مەدەرێ
یا دەبێ لەو خەمەدا، جەرگ و دڵم لەت لەت کەم.»

من دەبێ مافی گەل و کۆمەڵەکەم ژێر پا نێم
یا دەبێ چی هەقی میللەت بوو، ددانی پیانێم
ئەوی دۆستی گەلە، چۆن خۆمی لە پێناو نانێم
«من دەبێ مۆر لە سەری لێو و زمانم دانێم
یا دەبێ گەردن و مل، فێرە تەناب و پەت کەم.»

من دەبێ داری ئەویـنداری لە دڵما بڕوێ
یا بکەم شۆڕشی ڕزگاری، هەتا بۆم دەلوێ
لە سەر ئەم ڕێگە بڕۆم، تاکوو بەری پێم دەسوێ
«من دەبێ باسی شەهیدانی گەلم کەم بە جوێ
یا دەبێ باسی قژ و بەژنی شل و قامەت کەم.»

من دەبێ هەر لە سەر ئەم میللەتە بڕژێ خوێنم
هەر لە سەر مەردی و ئازایەتی بێ ڕێ و شوێنم

یا نە، مل کز کەم و لەو بارەوە کەس نەدوێنم
«من دەبێ سام لە سەر ناحەزی گەل بنوێنم
یا دەبێ خۆم بە بێ غیرەت و بێ هەیبەت کەم.»
من لە رێی مافی گەل و بەرزی وەتەندا بمرم
یا لە دلّداری بەدەر، هیچ لە دلاّرانە گرم
ناکرێ من خەمی دواکەوتوویی کورد داناگرم
«من دەبێ شوێنی جەوانانی شەهیدم بگرم
یا لە ژوور دەرنەکەوم، بیری هەل و دەرفەت کەم.»
من بە ماچی دەم و مەی رابببرێ رۆژ و شەوم
یا لەبەر دەرد و خەمی خەلّکی سەعاتێك نەخەوم
یا دەبێ ناحەزی میللەت بکەمە پێشرەوم
«یا دەبێ ناکەس بگرم، لە کەسم دوورکەوم
یا کەسم بگرم و خۆم تووشی خەم و مەینەت کەم.»
وەك هەلّۆژینی بەسەربەستی لە سەر ئەو کەلەکەم
یا بەرەو زۆر تەمەنی پەستی، میوانی قەلەکەم
دەبێ بۆبەختەوەری میللەتەکەی خۆم پەلە کەم
«یا دەبێ شۆق بدا رۆژی نەجاتی گەلەکەم
یا دەبێ تا دەمرم، روو لە شەوی نەکبەت کەم.»
خەفەتی دووبەرەکی، دەوری دلّ و مێشکی تەنیم
هەبینا داخی دەروون، خوێنی رەگ و مۆخی چنیم
بۆم نەگیرا هەرچی کردم لەمە باش‌تر تەسمیم
«یا دەبێ مل کەچ و سەرشۆڕ لە نێو مالّ بژیم
یا دەبێ روو کەمە کەژ، تەرکی هەموو لەززەت کەم.»
من کە دوو رێم لە بەرە، دیارە بەرەو دوو مەزلّم
چونکە لێم روون نییە بۆ کامی دەچێ ئاو و گلّم
جا ڕزم، مات و کزم، عاجز و دلّ پڕ لە کولّم

«ڕێگەیی من دوورە، چبکەم، چی یە دەرمانی دڵم؟
ڕوو لە پەستی کەم، یا ڕوو لە کەلی عیزەت کەم.»
گوایە نووسراوە لە چارەی هەموو مەخلووقی خودا
کە بڕێ خاوەنی سەرووەت بن و باقی دی؛ گەدا
دیلی بەرگێکە برا بۆلەشی هەشتا لە سەدا
«کۆیلەیی کورد دەڵێن ڕەحمەتە، حاڵی بە؛ فیدا
گەر ئەوە ڕەحمەتە، چۆن مەیلی بەزەی ڕەحمەت کەم.»

# پێنج خشتەکی لەسەر هۆنراوەکانی

# مامۆستا قانیع

# پێنج خشتەکی

لەسەر هۆنراوەی مامۆستای خوالێخۆشبوو: قانیع

چی بەسەر من بێ، لە سەر ئەم نیشتمانە جوانەیە
تووشی هەرچی بم، لە رێی ئەم خاکی کوردستانەیە
خۆش ترین جێی سانەوەم ئەم قوژبنی زیندانەیە
«ئاخرین ماڵی ژیانم کونجی بەندیخانەیە
ئەم کەلەبچە مەلحەمی زامی دڵی دێوانەیە.»

من وەتی کەوتوومە گرتو و خانە باشتر بیرئەکەم
بۆنەجاتی گەل لە دەس بێگانە راو تەگبیر ئەکەم
قەف قەفی دەسبەندەوا کۆرپەی دڵی پێ ژیر ئەکەم
«زۆر دەمێکە چاوەڕوانی زرزڕەی زنجیر ئەکەم
سەیری ئەم زنجیرە کەن، وەك زیوەری شاهانەیە.»

کیژی رزگاری دەخوازم، سەر دەبێ دانم لە رێی
مارەیی ئەو گیانی شیرینە، ئەویشم داوە پێی
بەو تەنافی گەردنم، پرچی ببەستێ، جوانە لێی
«بووکی ئازادیم ئەوێ و خوێنم خەنەس بۆدەست و پێی
هەڵقە هەڵقەی پێوەنم بۆ پڵپڵە و لەرزانەیە.»

تاکوو بەندم لێ گرانتر بێ، زەریف تر قاڵ ئەبم
بێنە دەر، زیاتر بە سەر سەر بەستیا ئەبداڵ ئەبم
من هەقم، رۆژێ بە سەر گشت ناهەقی دا زاڵ ئەبم
«گەرچی دوژمن وا ئەزانێ من بە دیلی لاڵ ئەبم
باش بزانێ، کونجی زیندانم قوتابی خانەیە
پیاو هەتا زۆرتر لە بەندا بێ، بە ئیمان تر ئەبێ

تاوەمێنێ هەست و بیر و باوەڕی، جوانتر ئەبێ
تا لە بەندا رامگرێ، دوژمن هەراسانتر ئەبێ
«بیری ئازادیم لە زینداندا فراوانتر ئەبێ
قوڕبەسەر ئەو دوژمنەی هیوای بە بەندیخانەیە.»

داغ و ئەشکەنجە و سزادانم شتێکی عادییە
جەزرەبەی سەختم نیشانەی ئەو پەڕی بێدادییە
دار و پەتك و گوللە هۆی رووخانی ئیستیبدادییە
«گرتن و لێدان و کوشتن، عامیلی ئازادیە
تۆپ و شەست تیر و کەلەبچە، لام وەکوو ئەفسانەیە.»

بۆ خەباتێك هەوڵ ئەدەم، دوژمن لە خاکم تار بکا
راپەڕینێکم ئەوێ، پێ‌شێلی ئیستیعمار بکا
چاوەڕێی یەك هێرشم، راوی بەرەی زۆردار بکا
«چاوەڕوانی شۆڕشێکم عالەمێ رزگار بکا
میللەتم بۆ ئەو مەبەستە کردەوەی شێرانەیە.»

شیعری من رووخێنەری کۆشکی زوحاکی بەدفەڕە
ئەسڵەحەی قورسم؛ دنە و هان دانی خەڵکی بۆ شەڕە
تۆپی پێنووسم بەرەو دوژمن بەهێز و تیژپەڕە
«چەکی شۆڕشگێڕی من، نووسینی بیر و باوەڕە
راپەڕینە، هەڵمەتی پڕ نەعرەتەی کوردانەیە.»

من وەتی هەم، ژێردەسی داگیرکەرانی روو رەشم
گوایە نووسراوە لە چارەم، هەر کە نەفتی بێ‌بەشم
بووکی سەربەستی بە کوێری دژ، دەگرمە باوەشم
«گەر بە ئازادی نەژیم، مردن خەڵاتە بۆڵەشم
نۆکەری و سەر دانەواندن، کاری نامەردانەیە.»

من بە قوربانی وڵاتی خۆم و گشت کێو و کەژیم
شەرتی پیاوان بێ‌هەتا ماوم بە سەرشۆڕی نەژیم

حافزم، ئیتر قبووڵ ناکەم لە دەربار و رژیم
«قانیعم، ئیمرۆ لە زیندانا بە ئازادی ئەژیم
سەد هەزار لەعنەت لەوەی، وا نۆکەری بێگانەیە.»

# ئەی دولبەر

### پێنج خشتەکی لەسەر پارچەیەك لە هەڵبەستە بەنرخەکانی خوالێخۆشبوو مامۆستا قانیعی نەمر

ئەی دەم کولی روومەت گوڵی گوڵزاری هەموو شۆخ
سەرتۆپی هەموو چاو مەس و عەییاری هەموو شۆخ
ئەی گوڵپەری ناز پەروەری سەرداری هەموو شۆخ
«ئەی دولبەری قەد عەرعەری سالاری هەموو شۆخ
مەحبووبی هەموو عالەم و نازداری هەموو شۆخ.»

یەك زەڕڕە لە ئەنواری مەلاحەت بنوێنە
یەك قەترە لە جۆباری لەتافەت بنوێنە
یەك شەمعە لە ئاکاری ئیشارەت بنوێنە
«یەك نوکتە لە ئەسراری نەزاکەت بنوێنە
وەك بەختی ئەمن رەش بکە بازاڕی هەموو شۆخ.»

خۆش دیمەن و رەفتاری وەکوو تۆ نییە، حاشا
تەنیا گوڵی گوڵزاری لە نێو باخچەیی پاشا
سەروی لەبی جۆباری، لەگەڵ شەرم و حەیاشا
«تۆ دولبەری عەییاری لە بازاڕی تەماشا
باجگیری هەموو سەڵتەنەت و باری هەموو شۆخ.»

سەربازی موژەت وازی لە کوشتار و ستەم بێ
باشاری نەکا ڕەنگە ئەگەر رۆم وعەجەم بێ
ئەم شارە هەمووی دولبەری مومتاز و یەکەم بێ
«تیری نیگەهی چاوت ئەگەر مەیلی عەدەم بێ
وێرانی ئەکا یەك نیگەهت شاری هەموو شۆخ...

پێنووسی قەزا نەخشی برۆی تۆیە لە دەسیا
نەقاشی قەدەر، خاڵ و خەتی تۆیە لە دەسیا

مەشتاقی سروشت، تاڵی قژی تۆیە لە دەسیا
«ئوستادی ئەزەل، ڕەسمی قەدی تۆیە لە دەسیا
هەر بۆیە وەها لەت بووە پەرگاری هەموو شۆخ.»
بێ مەیلی و زیز بوونتە، حاڵی منی شێوان
تۆران و بیانووتە، وجوودی منی فەوتان
لالووتی و گرژیتە، پەژارەی منی خولقان
«زوانەی گڕی دووریتە، دڵ و جەرگی سووتان
بێ عارە دڵم بۆ شەرەری ناری هەموو شۆخ.»
پیر بووم، نەگەیشتم بە ویساڵی مەهی تابان
رووی دەر نەکەوت تاوێ لە ژێر هەوری نیقابان
نامۆیە لەبەر چاوم ئیتر شار و خیابان
«مەستانە سفەت روو ئەکەمە چۆڵ و بیابان
خۆم دوور ئەخەمۆ ئیمڕۆ لە ئاساری هەموو شۆخ.»
بێ بایی یە عەقڵی من و سەرڕوشتەیی قانیع
چون خاڵی یە گیرفانی من و کیسەیی قانیع
بێ سوودە وتەی حافز و فەرموودەیی قانیع
«بێ تامە برا شیعری من و نوکتەیی قانیع
بازاڕی نەما نوکتە و ئەشعاری هەموو شۆخ

## پێنج خشتەکی لەسەر هۆنراوەکانی

# مامۆستا هێمن

چەن پارچە شیعری مامۆستای زانا
تەخمیسم کردوون، نەك تەواو مانا
زۆرم هەوڵ دا، هەرگیز نەمتوانی
تێکەڵ بم لەگەڵ هەڵبەستی جوانی
ئەو یاقووتی سوور، من مووروە شینەم
ئەو پەشم و ماهووت، من پەڕۆی پینەم
ئەو هەڵۆی بەرزی سەر دوندی یاڵە
من خەریك چینەم لەم پەین و پاڵە
لە شیعری ئەو دێ بۆنی سەربەستی
من داری پەستیم درایە دەستی
ئەو گەرەکیەتی رزگاری خەڵکی
منیش بوومەتە سەرباری خەڵکی
کێ بێ نەزانێ فەرقی ئەم دووانە
لە زەمینەوە تا ئاسمانە.

# گلێنەی شاعیر

## پێنج خشتەکی لەسەر هۆنراوەیەکی مامۆستا هێمن

ئەگەر خزمەت بە لێقە و ماوچ پڕ ئەجر و سەوابی با
لە ناو کۆمەڵ نەدەبوا پووڵپەرستی هێندە بابی با
هەبا بریا کەسێ وەك من دڵی پڕ تین و تابی با
«ئەگەر خەرمانی عومرم ئێستەکانێ پاکی با بی با
بە مەرگی تۆ مچوڕکیم بە دڵدا نایە با بی با.»

ئەوەی من زۆر درەنگی تێ گەیشتم خۆزگە زووبایە
لە عومرم خوێندن و زانین بە مێشکمدا نەچووبایە
دە بریا شوانە وێڵێك بام و چەن چوارپێم لە دوو بایە
«هونەر گەرمایەیی بەدبەختی و نەگبەت نەبووبایە
بەشی من بۆ دەبوو چارەڕەشی و خانە خرابی با.»

دە خۆم سوێندێ بە قورئانی خودا و پەرتووکی ئاوێستا
لە زانستگەی بەشەر دۆستی کەسێ نەیخوێندووە هێستا
فەقێی دووکەس لە دەردی خەڵکی حاڵی بایە تاوێستا
«لە کوێ حاڵی من وتۆوا دەبوو ئەی خۆپەرست ئێستا
ئەگەر دنیا ئوسووڵ و قائیدە و نەزم و حیسابی با.»

تەماشای دەفتەری ژینم کە ساقی، لێك دە ئەوراقی
ئەگەر دۆزیتەوە شادی لە نام و ژیریا ساقی
کەوا بوو عومری فانیم بۆچی‌یە بێنە مەیی باقی
«بە جامی بادە تێر نابم، ئەگەر مەیلت هەیە ساقی
گلێنەی خۆم دەنێرمە خزمەتت بۆم تێکە تا بی با.»

لە کووپەی تایبەتی خێرا پڕی کە و بمدەرە دەستی
دەبا وەیخۆم و رزگار بم لە دیلی و مەینەت و پەستی
لە دنیا بۆ کەسێ نەیچەشتبێ قەد تامی سەربەستی

«هەموو عومری ئەبەد تیٚ ی‌دا نییە خۆشی و دەمێك مەستی
خدر ئاوی حەیاتی بۆچ بوو فێری شەرابی با.»

مریشك و قەل لە بازارا نەما، بوونە کەبابی شێخ
ترێ دەس ناکەوێ، پاکی کرا کووپەی شەرابی شێخ
وەرە گوێ بگرە نەغمەی عوودوسێ تار و روبابی شێخ
«وە بەر من نایەلێ لێرەش مەی و ساقی، جەنابی شێخ
دەنا لەولا شەراب و حۆری با هەر بۆ جەنابی با.»

# هێلانەی بەتاڵ

پێنج خشتەکی لەسەر شیعرێکی مامۆستا هێمن

ئەگەر ئەو یارە بێ ڕەحمە بپرسێ قەد هەواڵی من
دەزانێ چۆن بە مەینەت رادەبووری مانگ و ساڵی من
لە دوژمن واوە کێ دەگرێتە مل دەین و وەباڵی من
«نییە باکم ئەگەر زاڵم شکاندوویەتی باڵی من
ئەوە سەختە کەوا ناگاتە گوێی کەس ناڵە ناڵی من.»

شنەی بای وەعدە پەیدا بوو لە بەفری سەرکەلانیدا
گلۆری کردەوە رندوو بە سەر شاخ و تەلانیدا
چرۆ کوێچکەی لق و پۆپ و چلۆوك و سەرپەلانی دا
«بەهار هات و تەبیعەت حوکمی ئازادی مەلانی دا
لە ناو کونجی قەفەس دا دیارە ئێستا چۆنە حاڵی من.»

لە سەر لووتکەی چیا سیرەی هەڵۆی سەربەرز و ئازا دێ
لە کۆساری چریکەی باز و قاسپەی کەو لە هەر لا دێ
لە سەر داری نەوای قومری لەگەڵ سروە و شنەی با دێ
«لە گوڵزاری وڕینگەی بولبولی سەرمەست و شەیدا دێ
بەڵام نایە جریوێکیش لە هێلانەی بەتاڵی من.»

لە سەر زارم وەلا ناچێ هەتا گوێ قەبری ناوی تۆ
دڵ و دینم، هەموو ژینم دەکەم قوربانی چاوی تۆ
لە دەستم داوە هۆش و بیر و تەدبیرم لە تاوی تۆ
«لە سەر ناچێتە دەر ساتێ خەیاڵی بسکی خاوی تۆ
ئەگەر چی تێگەیشتم چاوەکەم خاوە خەیاڵی من.»

ئەری بازی لە خۆرازی، دەمێ رامی مە بۆ نابی
ئەری تەرلانی جوانم بۆچی هاوڕازی هەڵۆ نابی

گوڵی سوورم لەگەڵ بولبول هەتا کەی گرد و کۆنابی
«ئەرێ ئەی ئاسکەکەی ئاسك، هەتا کەی دەستەمۆنابی
ئەرێ پیرۆزەکەی خۆش فڕ، هەتا کەی نایە ماڵی من.»
هەتا بۆ خۆت بەڵێنت دا، بە دووتا چەن وەڵامم نارد
گەلێک چاوەڕێ بووم و هەڵم کێشا هەناسەی سارد
بە ئاوات و هومێد و تاسەوە چەن مانگ و ساڵم بوارد
«کوتت بۆت دێمە جێ‌ژوانێ، هەزار سوێندت بە شاڵم خوارد
لە ئاهی ئاشقانەی من بترسە نەك لە شاڵی من.»
ورچ پارەی هەبێ، خەڵکی دەکەونە شوێنی، کوێرانە
ئەرەستوو بێ‌دراو بێ، پەخمەیە لەم کاولە ئێرانە
ئەگەر پەیکان لە بن پێتا بوو، دەنگت دێ دلێرانە
«کە ماڵت بێ، کەماڵت بۆچییە لەم شارە وێرانە
کەماڵی دەوڵەمەندی دی، گوڵم نەی‌ویست کەماڵی من.»
ئەگەر نەختێ وەفای ببوایە ئەو شۆخە پەلك زەردە
دەبوو زوو تێ‌بگا پارە پەرستی کاری نامەردە
کەساس و مل‌کەچم بۆیە دڵی بۆ من وەکوو بەردە
«ئەگەر دەیزانی مانای خۆشەویستی ئەو کچە کوردە
بە سەد یاقووت و گەوهەر نەیدەدا فرمێسکی ئاڵی من.»
بە سام و ترسناك و تووش و ناخۆش و سڕ و سەردە
سەرین بەرد و لێفەم ئاسمان و رایەخم هەردە
شەوی وا بۆمنی ئاخر شەڕو بێ‌ماڵ و چۆڵ گەردە
«رەش و تار و درێژ و پڕ لە ئازار و خەم و دەردە
بەڵێ شەوگاری دووری بوو سەراسەر ژینی تاڵی من.»

# گۆمی خوێن

## پێنج خشتەکی لەسەر هەڵبەستەکانی مامۆستا هێمن

دڵت بردم لە سینی هەشت و نۆڕا
هەڵتواسیم بە کەزیە و بەژنی شۆڕا
بەجێت هێشتم لە ناو شین و شەپۆڕا
«عەزیزم بۆچە تۆراوی لە خۆڕا
چ قەوماوە، دڵی تۆ بۆچی گۆڕا

کە تۆ رۆیشتی بۆ من دەرد و خەم ما
تەناسەی بێ کەسی و فرمێسکی چەم ما
کەژی هیوام لە ژێر بارستی تەم ما
«ئە تۆوا زوو لە بیرت کردم ئەمما
فەرامۆشت نەکەم شەرتە لە گۆڕا.»

وەتی تۆ زیزی من کارم کراوە
لە ژێر باری خەفەت پشتم چەماوە
لە حاندم دڵ‌رەقی، رەحمت نەماوە
«لە من راخۆخە تا یەك رووی نەداوە
ئەدی بێ مەیلی بۆ رووی دا لە تۆڕا.»

لە تۆڕایە خەم و دەرد و کوڵی من
بە دەس تۆیە رووناکی مەنزڵی من
لە باغی ژین ئەتۆی تەنیا گوڵی من
«ئەسیری کەزیەتە کۆتری دڵی من
دەبێ حاڵی چ بێ کۆتر لە تۆڕا.»

لە سەر چی زیزی زۆرت بۆ پەرۆشم
لە دەستم داوە ژین و رۆژی خۆشم
دەبێ وەك تازیەداران رەش بپۆشم

«سەر و ماڵ و کەماڵ و بیر و هۆشم
لە نەردی عیشقی تۆدا پاکی دۆڕا.»
بە ئاهم سیس و ژاکاوە گوڵی ژین
بە بەژنی من بڕاوە ماتەم و شین
لە سەر رووم ئاشکرایە شوێنی ئەسرین
«لە چاوم دێ بە خوڕ فرمێسکی خوێنین
کەچی ئەم گۆمە خوێنە هەڵنەچۆڕا.»
هەموو یارانی مەجلیس دەس لە ناو دەس
بە شوێن ئاواتی خۆی‌دا رۆیی هەر کەس
بەجێ ماوم منیش داماو و بێ‌کەس
«من و لاشەی پەپوولە ماینەوە و بەس
شەوی دووری شەمیش تەواوە لە گۆڕا.»

# تێهەڵکێش لە سەر پارچە هەڵبەستی تەشەنا ناسۆری دەروون

وەرە ساقی دەمەوێ ئەو شۆخە مەی دڵ کەم کەم
کوودە تایەک لە دژی دیقی دڵ و وەرهەم کەم

هەم چزاندوومی بە جامێک و دوو نامرێ کوڵ و کۆ
لووزەوم بەردە سەرێ، نامەوێ جورعەی کەم کەم

تەشەنا بۆتەوە ناسۆری دەروونم دیسان
جیا لە سەر خۆشی بە چی چارەیی ئەم دەردەم کەم

لێم وەسۆ هاتەوە سەرلەنوێ، برینی کۆنم
زامی کۆنە و بە مەیی کۆنی دەبێ مەڵحەم کەم

تانە ڕوو خاوە بڵا پڕ بێ لە خۆشی و مەستی
مەی و مەیگێڕ و دەف و نەی لەوە تا غم جم کەم

تا کوو کاول نەبووە هۆشی تیا ڕابێرم
تازە پێی ناوێ ئەمن هۆدەی خۆم مەحکەم کەم

ئێستە بۆ چارەیی خەم گۆشەیی مەیخانەیە جێم
من کە دەبوا گەلەکەم دوور لە خەم و ماتەم کەم

داخەکەم ئێستە بە مەی چارە دەکەم داخی دەروون
من کە ڕۆژێ دەمەویست میللەتەکەم بێ خەم کەم

چۆن پەنا بۆ مەی و مەیخانە نەبەم تێگەییوم
گەل فرۆش بم، دەبێ بێگانە بە خۆم مەحرەم کەم

خەم لە لای کێ بڕەوێنم بە مەی و مەستی نەبێ.
لەم وڵاتە هەموو شت زۆرە، بەنی ئادەم کەم

مشت و ماڵی دەوێ ئاوێنەیی ژەنگاوی خەیاڵ
هەر دەبێ چارەیی ئەم ئاوێنە بێ کەڵکەم کەم

بەوە پێک نایە کە هەر بیر بکەم و دامێنم

مەست و گێژم کە هەتا گاڵتە بە جامی جم کەم
ئەوشۆ خۆش ڕابـبرێ، سۆزی ببێ هەر چی دەبێ
بۆچی ئەم عومرە خەساری هەوەسی عالەم کەم
دەمەوێ تازەوە دووی واهیمە چیدی نەکەوم
بۆچی خۆم خەستەیی دووا ڕۆژی ون و موبهەم کەم
پیر و زورهانم و هێشتا دڵەکەم هەر دەیەوێ
خۆم بە قوربانی چەنەی چاوو زنەی زەمزەم کەم
بۆز بووە ڕیش و ددان کەوتووە دیسان بە تەمام
سەر و ماڵم بە فیدای خاڵ و خەت و پەرچەم کەم
داستانی مەم و زین کۆنە، کچێکم گەرەکە
دەستی باوێمە مل و ماچی لە کوڵم و دەم کەم
تۆرەمەی لاسم و وەك وی لە خەزاڵێ دەگەڕم
شلکەرانی بکوشم، بۆنی لە سینگ و مەم کەم
من لە جوانی دەگەڕێم، تێپەڕە زستانی دزێو
با پیاسێکی لە سەر چیمەن و لێوی چەم کەم
بەحری بێگانە بەجێ بێڵە، وڵاتی جوانم
کچ کە ڕووم نادەنێ، با سەیری گوڵ و شەونەم کەم
شەڕە بایە لە چیاکان و هەوا تووشە، دەنا
خۆم دەبوو تووشی کەژ و کێوی چڕ و پڕ تەم کەم
دوورە سەری قەندیل و ڕنو و زۆرە دەنا
وەکوو شێتان دەمەویست ڕوولە چیای حەستەم کەم.

# قەڵای نیشتمان

وەتەن یارەبی بۆمن بێ قەزای تۆ
سەر و ماڵم فیدای ئاو و هەوای تۆ
دەکێشم تا بژیم جەور و جەفای تۆ
«وەتەن گیان و سەر و ماڵم فیدای تۆ
وەگیانی من کەوێ دەرد و بەڵای تۆ.»
وەتەن تا من هەم وتۆم نیشتمانی
دەبێ بۆتۆی بەخت کەم عومری فانی
ئەتۆ بۆمن بەهەشتی جاویدانی
«لە پێناوت دەنێم سەر، تا بزانی
منم ڕۆڵەیکی ئازا و باوەفای تۆ.»
دەبم قوربانی نواڵەی کەسك و سوورت
فیدای کوێستانی بەرز و پڕ چنوورت
دەپێوم ڕێی درێژ و سەخت و دوورت
لە بۆپاراستن و حیفزی سنوورت
«لە باتی ماژینۆ سینگم قەڵای تۆ.»
وەتەن فەرزە لەسەر گشت تۆرەمەی ماد
لە ڕێی تۆدا بەخت کەن ماڵ و ئەولاد
هەتاکوو تۆ نەبی سەربەست و ئازاد
«دەبێ من چۆن بژیم مەسروور و دڵشاد
کە دەت بینم لە دەست بێگانەدای تۆ.»
لە خاکم هۆزی داگیرکەر بەسامن
دژی ویستی بەجێ و مافی ڕەوا من
سکاڵاو عەرز و دادم بێوەڵامن
«دەبێ کەی سەربەخۆ بی تۆ، هەتا من

بە سەربەستی بکەم سەیر و سەفای تۆ.»
وەتەن خاکت بەهەشتی سەرزەمینە
لە چاو تۆلەندەن و پاریس چ نینە
چەم و کانی و دەراوت ئاوی ژینە
«بە شینکە و گوڵ سەراسەر سوور و شینە
چ جوانە دیمەنی کێو و چیای تۆ.»
لە مێژ ساڵە لە زەحمەت دایە گیانت
بە تاڵ و سوێری تێپەڕبوو ژیانت
دنەی ئەم خەڵکە بۆتە ئەرکی شانت
«لەگەڵ تۆبۆنە جاتی نیشتمانت
دەدەن هێمن هەوڵ خوشك و برای تۆ.»

# کوردم ئەمن

گەرچی دوور کەوتەی وڵات و وێڵ و چۆڵ گەردم ئەمن
گەرچی ئاوارە و غەریب و مات و ڕەنگ‌زەردم ئەمن
گەرچی لە سوێی هاوەڵانم هەر بێنا مردم ئەمن
«گەرچی تووشی ڕەنجەڕۆیی و حەسرەت و دەردم ئەمن
قەت لە دەس ئەم چەرخە سپڵە نابەزم، مەردم ئەمن.»
من بە دووی نێو و نیشان و شۆرەتا ئەبدال نیم
شێت و ماخوولیای دراو و زێڕ و مڵک و ماڵ نیم
من ئەوینداری خرنگەی بازن و خرخاڵ نیم
«عاشقی چاوی کەژاڵ و گەردنی پڕخاڵ نیم
عاشقی کێو و تەلان و بەندەن و بەردم ئەمن.»
من لە کوێری و تاڵ و سوێری ڕۆژگار باکم نییە
من لە زیندان و شکەنجەی بێ‌ژمار باکم نییە
من لە هەڵواسین و لێدان و فشار باکم نییە
«لەت لەتم کەن، بمکوژن، هێشتا دەڵێم کوردم ئەمن.»
شەرتە تا ماوم بە شاخ و باڵی دوژمن هەڵنەڵێم
شەرتە کەوڵم کا قسەی ڕاست و دروستی پێ نەڵێم
من لە حەبس و زەبر و زەنگ و کوشت و بڕنابێ هەڵێم
«گەر لە برسان و لەبەر بێ‌بەرگی ئیمڕۆ ڕەق هەڵێم
نۆکەری بێگانە ناکەم تا لە سەر هەردم ئەمن.»

# بەرەو ئاسۆ

شێخی تەزویر و ریا بووم، ئێستە خۆشی یەك بەدەم
خاوەنی ریش و ئەبا بووم، ئێستا بادەم وا لەدەم
خەرقە و تەزبێح و سیواکم بە چۆری مەی دەدەم
«سۆفی کونجی خانەقا بووم، ئێستە پیری مەیکەدەم
زاهیدی خەڵوەتنشین بووم، ئێستە مەست و مەیزەدەم.»
دیمەنی لاولاو و عەرعەر شۆخ و دڵگیرن لە لام
گیانی تازەم پێ دەبەخشن، شەنگە بی و شۆڕە نەمام
خەڵفی شمشادیش بەژن شووش و پەسندی خاس و عام
«سەروی ئازادیش لە بار و دڵکەش و جوانە، بەڵام
گیانەکەم من شێت و شەیدای لار و لەنجەی ئەم قەدەم.»
دڵ بەڵێنی داوە تا ماوە وەدووی جوانی کەوێ
شەرتی پیاوان بێ لە جوانی واوە چی دی کەم نەوێ
دڵ لە هەر تیپێکی جوانی دەس کەوێ، پێی دەسرەوێ
«جیلوەیی جوانی لە هەرچیدا دەبێ خۆشم دەوێ
رۆژێ کوشتەی مینی ژۆپ و رۆژێ گیرۆدەی شەدەم.»
هەرشتێك جوانە لە رووکاری زەوی و ئاسمانی روون
بۆیە هەن تاکوو وەبووژێنن دڵی سیس و زەبوون
مانگ و رۆژ، ئەستێرە، هەرچی جوان و پەیدان و لە روون
«هەریەکەی بۆ خۆی دەجووڵێنێتەوە هەستی دەروون
زەردەپەڕ، کاروان کوژە، تاریك و روونی سوبحدەم.»
دەنگی مەل، رەنگی بەهار و دیمەنی دار و گیا
زەوتی سەر شار و بزەی یار و ئەوینی بێ ریا
پاکی ویستی ئادەمیزادن، لە یەك نابن جیا
«ئاسمانی روون و دەریای مەند و تارمایی چیا

سێوی لاسوور و بەهێی زەرد و هەناری گوڵبەدەم.»
کێ بە قەد من تاڵ و سوێری دووری یاری چێشتووە
کێ بە قەد من دەرد و رەنجی بێ ژماری چێشتووە
کێ بە قەد من ئاخی هەڵکێشاوە، ژاری چێشتووە
«کێ وەکوو من گەرم و ساردی رۆژگاری چێشتووە
گا لە دەشتی گەرمەسێرم، گا لە کوێستانی گەدەم.»
وەك چەمی کەڵوێ دەهاژێم و پشوودانم نییە
بێ وچانم، وەختی ماندوو بوون و وەستانم نییە
رێی هیوام گرتۆتە بەر، بۆیە خەمی گیانم نییە
«وەك شەپۆلی زێ خرۆم، ساتێ هەدادانم نییە
گێژ دەخۆم، پێچێ دەدەم، من رۆڵە کوردی ئەم سەدەم.»
گەرچی داگیرکەر سنووری لێ چنیوم، وەك سەوە
رەدڵی بردم، رۆژی تاساندوم وەك ئاڵ و شەوە
بێ چرا، ناشارەزا، چاو لێڵی تاریکی شەوە
«رێگە سەخت و پڕ لە کەند و لەند و هەڵدێر وگەوە
هەر دەبێ ببزووم، دەبێ بکۆشم، وچانی لێ نەدەم.»
تا مەبەست پێك دێ و مرادم بۆ دەبێ حاسڵ، دەڕۆم
لەو هەموو خێو و درنج و دێوە ناکەم سڵ، دەڕۆم
«سێبەری مەرگم لە پێش دایە و بەرەو مەنزڵ دەڕۆم
ئاخی گۆڕی تەنگە جێگەم، هەر تلاسا بێ قەدەم.»
من بە شوێن ئاواتی بەرزا، دوندی یالم گرتووە
عەشقی سەبەرزی لە کەللەی دام و حاڵم گرتووە
وەك دەپێوم رێگە، دیارە خووی شەماڵم گرتووە
«من بەرەو ئاسۆ، بەرەو رووناکی باڵم گرتووە
چۆن بەرەو تاریکی دەخشێم، پاڵ وە شەیتانێ دەدەم.»
داری بەرزم دی، بە هیچ لایەك لقی لێ جوێ نەبوو

بەردی قورسم دی، حەریفی لووزەوی ئاویّ نەبوو
کێوی نزمم دی بە بوولەرزەش دڵی تویّ تویّ نەبوو
«کانی روونم دی، بە لێشاوی بەهار شلویّ نەبوو
بەفری گەورەم دی، چیای گرت و بە تاویّ بوو قەدەم.»[1]
لەو دەمەی‌دا مەرگ بۆ سەر من سوپا و قۆشەن دەکا
بای هەناسەی دوایی خەرمانی هومێدم شەن دەکا
دوا تنۆکی ئەشکی ئاڵم رێی خەبات گوڵشەن دەکا
«ئاگری سینەم بڵێسەی دێ، وڵات رەوشەن دەکا
ئەو دەمەی خۆم وەک دڵۆپێک دەچمە نێو دەریای عەدەم.»

---

١- قەدەم؛ لێرەدا: هەڵم و بوخار.

ل ١٧٧ (هێمن)



# بۆسەی رۆژگار

هیچی لێ نابینی کوێستانی هومێدم، تەم نەبێ
زەردە روو ناکاتە سەر لێوم لە لێوی چەم نەبێ
کەس بە جەستەی گیانی ناشاد و دڵی خەستەم نەبێ
«نیمە ئاواڵێ لە گۆشەی بێکەسی دا، خەم نەبێ
چاکە ئەو لێرەش وەفای هەرماوە، سایەی کەم نەبێ.»
پیرە مەینەت تاقە هاورێمە، قەتم لێ جیا نییە
بۆسەعاتێکیش تەنانەت خێر و خۆشیم لا نییە
نەگبەتی وەك من لە ژێر ئاسمانی شین پەیدا نییە
«لاپەڕەی ژینم هەمووی هەڵدەیتەوە، تێیدا نییە
باسی فرمێسك و هەناسە و شیوەن و ماتەم نەبێ.»
چەرخی چەپ نەك هەر بە مەیلم یەك کەڕەت نەخولایەوە
بەڵکوو بۆ من رۆژ بەرۆژ داوی پتر دانایەوە
سەیرە دڵ بەو هەمووە داخ و دیقە بۆ نەتوایەوە
«رۆژگاری سپڵە بۆمن بۆسەیێکی نایەوە
نەمدی هەر تیرێکی دەیهاوێ بەرەو سینەم نەبێ.»
دیارە تاوانی فیداکاری و وەفا و دڵسافی یە
ئاشقی وەك من کە داماوی و کەنەفتی مافی یە
ئەی فەلەك تا کەی جەفا، مەمکووژە، بێ ئینسافی یە
«رەنجی دووری دڵبەرم بۆکوشتنی من کافی یە
گەر لە دنیادا ئەمن هیچ مەینەتی دیکەم نەبێ.»
پیری کردم داخ و دەردی یارەکەی چاوکاڵی من
خۆ دڵم تۆقی، بەرێکەوتیش نەهاتە ماڵی من
کێ وەکوو خۆم تێدەگا چۆنە ژیانی تاڵی من
«خوا دەزانێ چەن پەریشان و پەشێوە حاڵی من

ئەو کەسەی گیرۆدەیی ئەگریجە و پەرچەم نەبێ.»
لاسەشۆڕلێوی لە قوڵکەی گەردن و چاڵی چەنا
تەڕنەبایە خۆی لە پێناوی خەزاڵێ بۆ دەنا؟
داخەکەم ئەو شۆخە ڕێزی بۆ ئەوینم دانەنا
«ڕەمزی دڵداری لە زینێ فێر نەبوو یارم، دەنا
کوا ئەوینداری وەفاداری وەکوو من، مەم نەبێ.»
کەس وەکوو من لێی نەقەوماوە، کەساس و دوورەبەش
شان و سۆرانیم لە داخا، وەختە هەڵکێشم لە هەش
شۆخی لادێمان لە بەرتاوێ نەماوە کوڵمی گەش
«کیژی شاریمان لە خۆی وەرگرتووە، چارشێوی ڕەش
داخەکەم ئەمدی لەوێ مانگێ کە دەوری تەم نەبێ.»
سیس و ژاکاوم وەتی لێم زیزە تۆراوە گوڵم
وەك شەوی دەیجووره تاریك و تنووکە مەنزڵم
نامرادی بوو بە لافاوێك و بردی حاسڵم
«شادی جارێکیش بە میوانی نەهاتۆتە دڵم
ڕەنگە خەڵوەتخانەیی خەم شوێنی نامەحرەم نەبێ.»
بۆ گەلم شەرتە فیداکاری هەتا مردن بکەم
چم لە دەس دێ خزمەتی منداڵ و پیاو و ژن بکەم
خۆم دەبەتڵێنم هەتاکوو رازی خەڵکی وون بکەم
«خۆم دەسووتێنم هەتا بەزمی خەڵك ڕۆشن بکەم
کێ لە ڕێی خەڵکا وەکوو شاعیر دەسووتێ: شەم نەبێ.»

# تەپڵی ئەمان

خەیاڵ تیژباڵە، زەینیش نوکتەکێشە
تەبع سوارچاکە، زەوقیش زۆر لە پێشە
قەریحە، تیژە دەس مێ وەك درێشە
«قەڵەم سەرکێشە، بیریش مووقەڵێشە
بەڵام یارەبی رووی رەش بێ زەمانە.»
لەگەڵ من توند وتیژی کردە پیشە
بە حەسرەت جەرگی دەرهێنام لە ریشە
لە پێی شادی هومێدی دام بە تیشە
«دڵی تەنگم لە دەستانی هەمیشە
مەکۆگەی مەینەت و دەرد و خەمانە.»
گەلێ کینە و رقی لە منی هەژارە
لە حاندم ژەقنەمووتە، ژەهری مارە
دژی دۆستی منە، یاری نەیارە
«هەموو تیری بەلای ئەو رۆژگارە
دەکا بۆ سینگی پڕزامم کەمانە.»
بەڵا هەرچی لە ئاسمان دێتە خوارێ
دەڵێی پاکی بە سەر مندا دەبارێ
لە چاڵی مەینەتام و نیمە یارێ
«برا و خزم و کەس و کارم بە جارێ
ئەوان لێم بوونەتە داسی رەمانە.»[1]
وتی هەی چەرخی ناکەس تۆم رەقیبی

---

١ - مەبەست لە داسی رەمانە ئەوەیە؛ بە دەستی خۆت داس لە رەفیچکەی خۆت بدەی. واتە هۆرە لە خۆیەتی.

دەقیقێک نەبوە جەورم لێ نەدیبێ
لەگەڵما هێندە چەوت و نانەجیبێ
«لە ماڵی خۆم دەکەم بۆنی غەریبێ
کە بێزارم لە هەرچێکی هەمانە.»
ئەوی لایان وەبوو لێزان و ژیرین
کەچی ئێستا پێیان بێهۆش و بیرین
بەشێتمان دادەنێن چونکە فەقیرین
«ئەوی خۆشم دەویست وەک گیانی شیرین
تەماشای بۆتە مشتەی ناو هەمانە.»
سەیر کەن گورگە مێشی چاو چنۆکیش
بەرەو رووم شێرە هەڵدەستێنە چۆکیش
کەڵک دەگرێ لە پێم تاجی خسۆکیش
«لە راست من دێلە رێوی ترسنەکۆکیش
وەها راساک دەڵێی فیلی دەمانە.»
ئەوی بێئابڕوویی پێ کراوە
ئەوی ناموسی لا پووڵ و دراوە
هەموو شتێکی لە پێناو پارە ناوە
«ئەوی دایم لە ژێر خەڵکا ژیاوە
لە سەر من پاڵەوانە، قارەمانە.»
لە داپک بووم، مەلی شادیم رەمیوە
لە ژێر باری خەفەت پشتم چەمیوە
بە سەرمازاڵە، مەینەت داسەپیوە
«دەمی خۆشم لە ژینما قەد نەدیوە
بخوازم تاکوو خۆزگەم بەو دەمانە.»
گەپم بۆ پێ دەدەی چون خێوی زێڕی
بە خۆت پێ ناکەنی وەک ورچی لێڕی

لە فیلی مێ دەچی، زك عەینی تێری
«گەمەی تۆشم بە لاوە سەهلە خوێری
گەلێکم پێ کراون لەو گەمانە.»
ئەگەر چی دڵ پەرۆشم، مات و خەمناك
ئەگەر قەت نەمبووە و نیمە بەشی چاك
لەگەڵ خەڵکی ژیاوم پاك و بێ باك
«هەمە هیوا بە دووا رۆژێکی رووناك
بەشی ئینسانی بێ هیوا نەمانە.»
لەباتی شین و گریان و هەرایە
وەجووڵێ، راپەرینت بێنە کایە
ئەوی زانای بەرێز فەرموویە، وایە
«بە شیوەن چاری کاری ئێمە نایە
خەبات کەڵکی نییە مامە خەمانە.»
لە داخت چەرخی چەپ، خوای گێچەڵ و گەڕ
لە دەس تۆ دوژمنی شۆفار و زۆر وەڕ
لە حەیفت بەختی رەش، ماکی قڕە و شەڕ
«لەبەر تۆ چارەنووسی شووم و بەدفەڕ
ئەوەی قەبدڵی نەدەم، تەپڵی ئەمانە.»

- ١٤٨ -

# ڕەق هەڵاتم

من لە دەس زۆرداری هار و شاری بێ‌ڕەونەق هەڵاتم
من لە تاوی زەبر و زەنگ و گرتنی ناحەق هەڵاتم
من لە تانەی دۆست و جەوری دوژمنی دڵڕەق هەڵاتم
«من لە حەیفی خزمی خوێڕی و ئاشنای ئەحمەق هەڵاتم
من لە داخی زاق و زووقی ئەمنیەی چاوزەق هەڵاتم.»
من کە دڵسۆزی وەتەنم و ڕۆڵە کوردی قەرنی بیستم
جیا لە سەربەستی وڵات و گەل نییە ئامانج و ویستم
هەر لە سەر ئەم خاکە پیرۆزەم بەخت کرد تین و هەستم
«چۆن بە خۆشی خۆم بەجێ دێڵم وڵاتی خۆشەویستم
من لە ترسی زللە و باتۆم و دار و شەق هەڵاتم.»
چم دەڵێی داخۆ بەسەرهاتوە لە ڕێگەی ئەم خەباتە
چەندە ماندوو بووم و چەوساوم لەگەڵ ئەم کارەساتە
تاکوو تێ پەڕبووم لە کەوشەن، خۆ نە کەوشم ما، نە پاتە
«هەر بە پێیان و بە کۆمەکۆمە گەیمە ئەم وڵاتە
ڕەنگە پێت وابێ بە سواری ماینی گوێ‌لەق هەڵاتم.»
کەس بە زۆری پێ‌نەکردم، بەڵکوو هەر بە خوایشی خۆم
تووڕم هەڵداوە لە ڕێی ئازادی یا ئاسایشی خۆم
با لە بەر دەس تەنگی بفرۆشم سەعات و قایشی خۆم
«نۆکەری بێگانە ناکەم، هاتە جێ فەرمایشی خۆم
وا لە برسان و لەبەر بێ‌بەرگی ئیمڕۆ ڕەق هەڵاتم.»

# ڕقی پیرۆز

## پێنج خشتەکی لەسەر وردەواڵەکانی مامۆستا هێمن

دەمکوتێ ئەمما لەگەڵیا ڕۆژبەڕۆژ ناجوورترم
دەمکوشێ وەك مۆتە ئەمما بۆ خەبات مەجبوورترم
دێتە پێش ئەمما ئەمن لەو جار لەگەڵ جار دوورترم
«دەمگرێ ئەمما لە گرتووخانە ڕق ئەستوورترم
لێم دەدا ئەمما لەسەر داوا ڕەواکەم سوورترم

دەمبڕێ ئەمما لە پاش بەینێکی دی دەڕوێمەوە
دەمبەسێ ئەمما بە کوێری چاوی دز دەکرێمەوە
دەمپەشۆکێنێ بەڵام هەر زوو وەسەر خۆ دێمەوە
«دەمکوژێ ئەمما بە گژ جەللادەکەمدا دێمەوە
کوردم و ناتوێمەوە، ناتوێمەوە، ناتوێمەوە.»

# بۆچمن

ئەی خودای باخەبەر لە هەستی دەروون
ئەی بە دەس تۆیە مان و بوون و نەبوون
نوقمی نێعمەت دەکەی برێك و هێندێ زەبوون
«ئەی خودای گەورە، خاڵقی بێچوون
ئەی ئەوەی دات بە ئێمە زار و قوون.»
خۆت دەزانی کە بێکەس و کوێرم
زك زەلامم، بە خواردنیش فێرم
بشمرم خۆبە خەڵکی ناسپێرم
«یا ئەوان بگرە، یا بکە تێرم
تێر نەبم بۆچمن سەر و ژێرم.»

# بۆ کچە کوردێک

بەژن لاولاو و شۆخ و چاو خوماری
کەزی شۆڕو شل و مل، گوێ بە گواری
نیگاری خونچەزاری مەم هەناری
«کچە کوردێکی نەشمیل و لە باری
بەوەی نییە ماوەیێکە چوویە شاری.»
لە کوێ بی دێمەوێ، پەیمان ئەبەستم
ئەتۆی تەنیا گوڵی هیوا و مەبەستم
لە پێناوت دەنێم ئاوات و هەستم
«ئەگەر پێت خۆشە هەر وا بت پەرستم
نەکەی لادەی لە دابی کوردەواری.»

# دیلی دیلم

لە داوی گوڵعوزارێکا، دەڵێی یەخسیری باستیلم
تەنانی پرچەکەی خستۆتە شان و گەردن و پیلم
سەرم لەو کارە سوور ماوە کە بە رواڵەت دەڵێی فیلم
«ئەسیری بسکی ئاڵۆزی کچە کوردێکی نەشمیلم
تەماشا کەن چ سەیرێکە بە دەستی دیلەوە دیلم.»

## کچی مەهاباد

لەباری، نازەنینی، نەرم و نۆڵی، دڵتەڕی، شادی
نیگاری، خونچەزاری، مەم هەناری، سەروی ئازادی
ئەتۆی تەنیا گوڵی شاری، بە پۆز و قۆز و نازداری
لە چاوی بەد بە دوور بی ئەی کچی جوانی مەهابادی
لە جوانی‌دا، لە پاکی‌دا، نییە هاوتات و نازانم
لە حۆڕیانی بەهەشتی، یا دوڕێکی تازە ئیجادی
لە ڕێك و پێکیا وێنەت نییە، باوەڕ کە تێ‌ناگەم
فریشتەی ئاسمانی، یا نە، پەروەردەی پەریزادی
سەری کوڵمەت گەشە، هەر وەك گوڵی کوێستانی کوردوستان
قەد و باڵا سنەوبەر، یا نەمامی باخی شەددادی
گەلاوێژ چاوی هەڵنایە، لەبەر چاوی گەلاوێژت
لەبەر بەژنت دەبێ سەر دانەوێنێ خەڵفی شمشادی
لە کوێ وەك من دەزانێ چەندە شیرین و ڕەزاسووکی
ئەوی دەیکوت وەباڵی تۆم بە مل، بێ عەیب و ئیرادی
وەکوو من دیارە تێ‌ناگا کە چەندە شۆخ و دڵگیری
کەسێکی تۆی لە ڕێبازا لە ژێر چارشێوی ڕەش‌دا دی
دڵی سەد عاشقت کردە نیشانەی تیری موژگانت
دەس و مستت لە عاشق کوشتنا زۆر ڕاستە، سەیادی
بە دەس ڕیژی مژۆڵی چاوەکانت سەد کەلاکت خست
کچی کوردی، لە تیر ئاویشتنا مەعلوومە ئوستادی
بە شمشێری دوو ئەبرۆت جەرگی خەڵکی لەت دەکەی، دیارە
کە پەنجە و لێوی ئاڵت شاهیدن، خوێنخۆری، جەللادی
بە خنجێری بژانگت کوشتنت لا سووك و هاسانە
دەزانی چەك دەکار بێنی، کچیش بی تۆرەمەی مادی

لە سوێیانت وەها دێوانە بووم، ئەی شۆخی شیرینم
منیشت هەر بینا، مەجنوونی دەشت و کێو و سەحرادی
لە تاوانت وەها پەتیارە بووم و شێت و ماخوولیا
لە قەرنی بیستوما وەختە رچاوکەم کاری فەرهادی
ئەسیری حەڵقەیی زنجیری زوڵفی تۆیە دڵ، ئەی گوڵ
مەحاڵە قەد نەجاتی بێ لە کۆت و بەندی بێدادی
سەڵاڵەو عاشقەی کۆتری دڵی کەوتۆتە داوی تۆ
نەبینێ ئەو ئەسیرە، تازە رەنگە رەنگی ئازادی
لە بیرتە ئەو شەوەی بۆم هاتییە ژوانێ بە تەنیایی
کوتم: یادت چلۆن کردم؟ کوتت: هەر تۆم لە سەر یادی!
دەسم هاویشتە ئەستۆت و دەمم هێنایە سەر کوڵمت
کوتم: خۆشت دەوێم گیانە. بزەت هاتێ، کوتت: ئا، دی
ئەتۆ ئێستا لەوێ دیلی دەسی بێگانەی و ئەمنیش
لە تاوی تۆ قەدم خۆشی نەدی، بێجگە لە ناشادی
وەتی دەستی جەفا ئێمەی وەها لێك هەڵبڕی گیانە
لە دووری تۆ دەکێشم دەرد و رەنج و داخی بێمرادی
زەمانە هێمنی ئاوارەیی چۆڵ و بیابان کرد
لە پێناوی وڵاتی نا، ژیان و ماڵ و ئەولادی
لە رێی ئێوە گەلێ جەور و جەفای کێشاوە توخودا کەی[1]
فەرامۆشی مەکەن، بێچارەیە، جارجار بکەن یادی.[2]

---

١- وەکوو حافز لە رێی ئێوە، جەفای کێشاوە، خزمینە
٢- وەکوو حافز فەرامۆشی مەکەن توخوا بکەن یادی.

# عیشق و ئازادی

زەمانە خوا دەزانێ چم بە سەر دێنێ دەمێکی تر
دڵی کەیلم دووبارە رێکی دەکوشێ ماتەمێکی تر
ئیتر بۆ زامی دڵ بێجگە لەمەی کوا مەڵحەمێکی تر
«ئەگەر چی شەو درەنگە، ساقی بۆم تێکە کەمێکی تر
کەوا ئەمشەو سەری هەڵدا لە ناخمدا خەمێکی تر.»

وەرە مەی تێکە ساقی بۆمنی چارەڕەش و داماو
بە چەن جامێك دڵی سیس و زەبوونم بۆبکە پاراو
دەزانی خێری چەندە زۆرە، دەم وشکێ بکەی تێراو
«لە بادە ئەم ژەمە تێرکە، منی تینووی جگەر سووتاو
بە چی دیارە کە دەیبینم، شەوێکی تر، ژەمێکی تر.»

هەزاران ئارەزوو و ئاواتی کۆن و نوێم لە دڵدایە
لە چاخی لاوی یا بۆم پێك نەهات تازە بەدی نایە
لەبەر ژانی لەش وگیانم، ژیانم لا وەکوو بایە
ئەوەندە دەردەدار و بێ پەرستارم کە پێم وایە
لەسەر کێکی تەمەن هەڵناکرێ تازە شەمێکی تر.»

لە ژینمدا گەلێکم دیوە شادی و شیوەن و رۆرۆ
هەڵم کێشاوە زۆر جاران، هەناسەی پڕ گز و بۆسۆ
بە هەڵکەوتیش رووناکی خۆی نیشان داوم لە دەم ئاسۆ
«گەلێکم رۆژگاری تاڵ و شیرین رابوارد ئاخۆ
مەرگ مەودا دەدا دیسان، ببینم سەردەمێکی تر»

بە تاڵ و سوێری تێپەڕبوو، منالّی و سەردەمی جوانیم
بە شوێن سەربەرزی یا رێم گرتەبەر پێم وابوو لە دووا نیم
بە هەڵدێر و گەوە و چڕدا، وەسەر کەوتم هەتا توانیم
«گەیشتمە سەر ترۆپکی ئارەزوو رۆژێ کەچی روانیم

پێشم دایە زەردوماە و سەخت و ئەستەمێکی تر.»

وەتی من دێتە بیرم پڕ لە دەرد و داخە ژینی کورد
لە ئەسپی ئارەزوو ئاواتی گەل نەکراوە زینی کورد
دەزانی بۆچی دووا کەوتم لە دڵداری و ئەوینی کورد
«هەتا چارشێو بەسەر تۆوە دەبینم نازەنینی کورد
بەسەر بیبیلەکەی چاوی منا دەکشێ تەمێکی تر.»

هەتا وا بێ دەمی بەختی مە تاوێ خۆشی ناچێژێ
لە باخچۆڵەی هومێدم کەس نەمامی شادی نانێژێ
برین و زامی دڵ کوانێ بە مەلحەم دێنێ سارێژێ
«نەما خانی هەتا چیرۆکی عیشقی ئێمە دارێژێ
دەنا هێشتا لە کوردستان دەژین زین و مەمێکی تر.»

وەها مەستی مەیی عیشقم کە بەرنابێ لە دەستم جام
بەرەو شێتی دەچم دیارە لە دەستم داوە عەقڵ و فام
لە هیچ جێیەك نییە سەبر و قەرارم، عەینی ماخوولیام
«پەپوولەی خۆشەویستی من لە شوێنێ ناگرێ ئارام
دەنیشێ و باڵی دەبزوێنێ لە سەر سینە و مەمێکی تر.»

لە ژێر پێتی دەنێی عیشقم، ئەگەر کەوتووم لەبەر پێشتا
بە هاوڕێم قەبووڵ ناکەی، کەوا خۆڵم لەسەر ڕێشتا
نەچوو دەستی کڵۆڵی من، بە باخی سێو و هەرمێشتا
«هەزار هێندە پەرێشان و سیاچارە بژیم هێشتا
لەنێو دڵدا هەمە ئاواتی خاڵ و پەرچەمێکی تر.»

بە دڵ باوەڕبکە ئەی گوڵ، لە چووکەی خۆت، ئەوەی بیستت
سەر و ماڵم لە ڕێتە بۆ بەجێهێنانی پێویستت
قەرار بوو بێیە جێژوانێ، وەگێڕی بۆم هەس و نیستت
«شەوێکی چاوەنوارت بووم، نەهاتی گیانەکەم، ویستت
منی دڵناسك و شاعیر، بگێڕم ماتەمێکی تر.»

کچە کوردێکی شۆخم دی، سووتانمی ئاهی پڕتینی
کوتم حەیفە کچێکی وا، بە تاڵی تێ پەڕی ژینی
لەسەر کوڵمەی گەشی دەتکوت، دوڕو یاقووتە ئەسرینی
«کە فرمێسکم لەسەر روخساری کیژی دڵشکاو بینی
کوتم: یاخوا لەسەر سوورگوول نەبینم شەونمێکی تر.»
ئەگەر چی زۆر لە مێژ ساڵە، لەژێر زنجیری بێدادیم
وەتی عومرم هەیە ژاکاو و سیسی دەستی بێمرادیم
بەڵام هێشتا بە ئاواتی ژیانی خۆش و دڵشادیم
«هەتاکوو دواپشوو رێبواری رێگەی عیشق و ئازادیم
ئەگەر بێجگە لە ناکامیش نەبینم بەرهەمێکی تر.»
لە ڕێی دڵداری یا تا هەم، بکێشم رەنج و بترووسێم
قەدی لێ نابەزم، سۆنەم، لە دەریاشم خە ناخووسێم
ئەوەندەم عومرە دەس باوێمە ئەستۆی یار و رامووسێم
«خدر نیم بۆ تەمەن شێت بم، بە کانی ژیندا نووسێم
ئەوەندەم ژین دەوێ تا دەم دەنێمە نێو دەمێکی تر.»
ئەوەندە دڵ شکاوی دەستی زوڵم و ناهەق و زۆرم
نەماوە شەوق و زەوقم، داتەپیوم، مات و بێ شۆرم
لە شادی بێ بەشم، چارەڕەشم، ئاڵۆز و ناجۆرم
«بە تۆ چارەی چلۆن دەکرێ دەروونی پڕ لە ناسۆرم
خەساری بۆ دەکەی دکتۆری زانا مەڵحەمێکی تر.»
لە دەست و گوێ برینی خەڵک و فێڵبازی کەمێ لادە
وەرە بۆ سەیری ئەم باخ و ڕەزانە خەم بە دەم بادە
بە کورتی پێت بڵێم مانای ژیانی بێ قڕە و سادە
«بەهار و گوڵ، کچ و مانگەشەو و شێعری تەڕو بادە
لەمە زیاتر جەنابی شێخ گەڕەکتە عالەمێکی تر.»
حەیف داخی گرانم بۆ کوڕێنی و سەردەمی لاوی

کە بۆی تەرخان دەکردم یارەکەم لیمۆی نەژاکاوی
بە مەیل و تاسەوە دەمگرتە باوەش بەژن و لاولاوی
«لەپڕ پیری یەخەی گرتم، وەها کەوتوومەتە داوی
لەگەڵ پڕمین و کۆخین دێتە گوێم زیر و بەمێکی تر.»

وەرگێڕانی گوڵبژێرێك لە

# چوارینەکانی سەعدی شیرازی

سەرچاوە: کلیات سعدی، نسخه محمدعلی فروغی، انتشارات شقایق - تهران - چاپ اول ۱۳۸٤



# گوڵبژێرێك لە چوارینەکانی سەعدی شیرازی

خوێنم بە کوڵ و جۆشە لە ناخی دڵی کەیل
کێ حاڵی یە چیم دیوە لە یاری بێ مەیل
هەر ئەو کەسە ئاگایە لە دەردی مەجنوون
دیبێتی لە نێزیکەوە ڕووکاری لەیل.

هردم غم از درون گوشه خون را
وآگاه نی ز مردم بیرون را
الا نگر آن که روی لیلی دیده است
داند که چه درد می‌کشد مجنون را

دیلن کە لە دەرکی تۆ ئەویندار، وەرە
جارز نییە کەس لە تۆسنی یار، وەرە
چت کردووە زوڵم و زۆر، حەقی خۆتە گوڵم!
پێشتر لەوە پێت بڵێن جەفاکار، وەرە.

عشاق به درگهت اسیرند بیا
بدخوی تو با تو نگزیرند بیا
هر جور و جفا که کرده‌ای معذوری
زان پیش که عذرت نپذیرند بیا

چاوت بە خەوی ناز و بەمەی مەست و خومار
زانا هەموو تینو و تن و وەسڵت نادیار
وێنەت کە نەبینراوە لە هیچ کوێ، تەنیا
ئاوێنە و ئاو بوونە سەبەب بۆ دیدار.

ای چشم تو مست خواب و سرمست شراب
صاحب‌نظران تشنه و وصل تو سراب
مانند تو آدمی در آید به خواب
نه شد که در آیینه توان دید و در آب

دوور خستنی دڵ لە خۆشەویست ناتوانی
خۆڕاگری یە دەردی ئەوین؛ دەرمانی
یا دەس مەبە بۆ خونچە، لە گوڵ واز بێنە
یا گوێ مەدە جەوری دڕك و ئێش و ژانی.

جز دل ز هوای دوست نتوان پرداخت
در دانش تحمل است و سر پیش انداخت
یا ترک گل لعل همی باید گفت
یا با الم خار همی باید ساخت

ڕۆژێکی وتت: شەرتە شەوێك دەتکەم شاد
لەو بەندی مەراق و داغە دەتکەم ئازاد
لەو ڕۆژەوە دیت چەندە شەوان هاتن و چوون
تەد قەوڵ و قەراری خۆت نەهاتۆتەوە یاد.

روزی گفتی شبی کنم دلشادت
وز بند غمان خود کنم آزادت
دیدی که از آن روز چه شبها بگذشت
وز گفته خود هیچ نیامد یادت

دەروا دڵ و چاو، ناشێ لە دووی بێ هەموو دەم
تەقوا نەبوو، نابووری لە دینار و دەرەم
کەی ئاگری شەم گیانی پەپوولەی سووتان
سووتاندی کەسێك ئاگری بەرداوە لە شەم.

دل می‌رود و دیده نمی‌شاید دوخت
چون زهد نباشد نتوان زرق فروخت
پروانه نه مستمند آتش شمع سوخت
آن کس که شمع را همی
می‌افروخت

زۆرم کوتووە بە کڵفەت و کار دارت
ئاوێنە قەدی نەهێنە بەر ڕوخسارت
ترسم هەیە مانگی ڕووت بینی تێیدا
هێند بایی ببی بە کەس نەمێنێ کارت.

صد بار بگفتم به غلامان درت
تا آینه دیگر نگذارند برت
ترسم که ببینی رخ همچون قمرت
کس باز نیاید دگر اندر نظرت

ئەو یارە کە عەهدی خۆشەویستی دەشکان
داوێنی لە دەسما بوو کە خۆی ڕاپسکان
فەرمووی لەوەلا بە خەونی خۆش بمبینە
خەونێ کە هیوای وەسڵی لە دڵتا خولقان.

آن یار که عهد دوستداری بشکست
می‌رفت و منش گرفته دامن در دست
می‌گفت دگر باره به خوابم بینی
پنداشت که بعد از آن مرا خوابی هست

کێ بوو کە بە دڵنیایی پاڵی داوە
پێی وایە ژیان مۆڵەتی زۆر پێ داوە
مێخ دانە کوتێ، خێوەتەکەی پێچراوە
جڵ دانەکەنێ، باری سەفەر بەسراوە.

آن کیست که دل نهاد و فارغ بنشست
پنداشت که مهلتی و تأخیری هست
گو میخ مزن که خیمه می‌باید کند
گو رخت منه که بار می‌باید بست

قەد نەچووتە چاوم خەوی شیرینی شەوان
هەستی مەیی یادی تۆ بوو عالەم لە خەوان
پێم خۆشە بەدەستی خۆت بڕێژی خوێنم
داوێنی مراد بگرم و بادەر چێ ڕەوان.

شبها گذرد که دیده نتوانم بست
مردم همه از خواب و من از فکر تو مست
باشد که به دست خویش خونم ریزی
تا جان بدهم دامن مقصود به دست

مەست و وڕی سەوداتە سەری هۆشیاران
خۆزگەم بەوە دڵ دانێ لە سەر ڕووی یاران
گەر تۆ نەبی هیچ نییە لە ناو مڵکی وجوود
تۆ هەی، هەموو هەن، ئومێدی شەو بێداران.

هشیار سری بود ز سودای تو مست — خوش آنکه ز روی تو دلش رفته ز دست
بی تو هم هیچ نیست در ملک وجود — ور هیچ نباشد چو تو هستی همه هست

کێ زوڵمی لە لاعە دڵە، شەڕی پێ خێرە
بۆ پینە بکەی، خەتایە، ئەو زل کوێرە
هەر ئەو ڕووە دەنوێنێ لە زاتی دایە.
ئاوێنە چەوێڵ بوو، ڕووتی پێ مەسپێرە.

آن کس که خطای خویش بیند کرو راست — تقریر مکن صواب نزدش که خطاست
آن روی نمایدش که در طینت اوست — آیینه کج جمال ننماید راست

گەر کوێرە وەری خەڵکی خەتای ئێمە بووە
یا سووچ و هەڵەی ئێمەیە هۆی ترشی ڕووە
ڕووی پاکی وەکوو شیر دەگۆڕێ سۆزی
ئەوکاتە وەدەرنانی مە وەك ماست و مووە.

گر زحمت مردمان این کوی از ماست — یا جرم ترش بودن آن روی از ماست
فردا متغیر شود آن روی چو شیر — وانگه برون شویم چو زان موی از ماست

بەو بەچ قیامەتێکە بەژن و باڵات
مەوزوونی قەدت لە قامەتی سەرو نەهات
پێویستە کە جاروبار بچی بۆ زیارەت
تا مردوو نەڵێن حەشرە، قیامەت داهات.

وه وه که قیامت است این قامت راست — با سرو نباشد این لطافت که تو راست
شاید که تو در گذر به زیارت گروی — تا مرده نگوید که قیامت برخاست

سەرو لە قەد و قامەتی تۆ جوانی برد
دەریای دەمی تۆیە دوڕڕ و مەرجانی برد
یەك تاقە وەنەوشەم دی لە هەر کوێیە، دەڵێم:
بامووی سەری تۆیە بۆ بیابانی برد.

سرو از قدت اندازه بالا بردست — بحر از دهنت لؤلؤ لالا بردست
هرجا که بنفشه‌ای ببینم گویم — موئی ز سرت باد به صحرا بردست

ئەوشۆ کە ژوانی یاری بێ ڕووناکە
بەختم کە بە کوێری دوژمنان زۆر چاکە
بێژن بە چرا وەکوو جێ مانگ ئاوابێ
چون ئەو شەوە تۆم لە لابێ، ڕۆژی پاکە.

امشب که حضور یار جان‌افروز است
بختم به خلاف دشمنان پیروز است
گو شمع بمیر و مه فرو شو که مرا
آن شب که تو در کنار باشی روز است

ئەو ڕۆژە کە تۆم لابی، ئەمن پیرۆزە
هەر ڕۆژێ لە گەڵ تۆ گوزەرا، نەورۆزە
تێپەڕبووە دوێ، بەرهەمی ژین ئیمڕۆیە
چاوی تەقەلا ببڕیە سۆزی، سۆزە.

آن شب که تو در کنار مایی روز است
و آن روز که با تو می‌روم نوروز است
دی رفت و به انتظار فردا منشین
دریاب که حاصل حیات امروز است

مەشهووره هەوای مانگی ئازار خۆشە
بۆنی گوڵ و دەنگی مەلی گوڵزار خۆشە
ئاوازی نەی و زیر و بەمی تار خۆشە
ئەی بێ خەبەران گەشتی لە گەڵ یار خۆشە.

گویند هوای فصل آذار خوش است
بوی گل و بانگ مرغ گلزار خوش است
ابریشم زیر و ناله نی زار خوش است
ای بی‌خبران این همه با یار خوش است

با هەستم ئیتر بکەومە شوێن تاقە گوڵم
گیان باوێمە بەرپێی ئەو سوکنایی دڵم
لای دوژمن و دۆس دەڵێم کە یار بمکوژێ
ئازادە، هەقی خۆیەتی، نەیکردووە زوڵم.

خیزم بروم چو صبر نامحتمل است
جان در قدمش کنم که آرام دل است
و اقرار کنم برابر دشمن و دوست
کآن کس که مرا بکشت از من بحل است

١٤ی جۆزەردانی ٦٩

# وەرگێڕانی

# چوارینەکانی فەڕوخی یەزدی

فارسیەکانی لەرووی (دیوان فرخی یزدی) به اهتمام حسین مکی،
چاپی ئەمیرکەبیر، چاپی ٧ ١٣٤٣ دانراوە

# چواریەکانی فەڕوخی یەزدی

خێزانی بەشەر، پاکی لەسەر ئەم خوانەن
١٨٩ دیلی دەسی ئەو دەوڵەتە ناپیاوانەن
ئەی خەڵکی جیهان، دەوڵەتەکان زۆر پەستن
سەرپاکی چەتە و ڕێگری ئەم کاروانەن.

ئەو تیپە خەڵك پێری لێیان ڕەنجاون
١٩٠ دوێ گشتی بەبێگانەوە پێ بەستراون
ئەندامی گرینجی دەوڵەتی بوون دوێ شەو
ئیمڕۆکە بە نوێنەری خەڵك ناسراون.

کەس نەبووە بە هۆی پارە بە پێغەمبەری خوا
١٩١ کەی بوون و نەبوونە هۆی نەمانی دەعوا
کێشە و قرەکەم نابێ لە ناو چینی مرۆ
تا قیمەتی کات و دەم وەکوو یەك نەڕوا.

پێت خۆشە بکەی دەردی هەموو کەس چارە
١٩٢ ئیش بەو کەسە خۆماڵییە، ڕاوێژ کارە
بسپێرە کە ئەو وەزیفەناسی بەڵەدە
دۆستانە لە گەڵیا بدوێی جارجارە.

ئەو دڵبەرە نەشمیلانە پیریان کردم
ناموڵە دڵ و دین زویریان کردم
١٩٣ وەك خاڵی ڕەشی گۆشەیی لاجانگ و برۆ
داماو و کەنەفت و گۆشەگیریان کردم.

ئەی تاقمی پڕ فیز و هەوا ڕەحمو هەبێ
١٩٤ بۆچینی هەژار و بێنەوا ڕەحمو هەبێ
دەرهەق بەکرێ گرتە کە بەندەی ئێوەن
زۆر بێ بەزەیین، لە ڕێی خوا ڕەحمو هەبێ.

کینە و غەزەبە دروشمی ئاڵای گەردوون
١٩٥ ئاژاوەیە ڕۆژهەڵاتی داگرتووە پتوون
داماوە لە گۆمی خوێن پەری سوڵح و سەفا
کەوتۆتە هیلاکەت و مەترسی قومبوون.

پەیکانی موژەت لە خوێنی دڵدا سوورە
١٩٦ تێك نانی بروێت پڵنگی قین ئەستوورە
پارێز کە لە ناڵەم کە دڵی ئاسنی تۆ
چی نەرمی دەکا مەگەر بڵێسەی کوورە.

ئاخ بێجگە لە ڕەنگی ئاشتی ڕەنگ نەدەبوو
١٩٧ بێ پارە بە دەس لۆردەوە دڵ تەنگ نەدەبوو
جێگیر دەبوو ئاشتی لە ناو چینی بەشەر
سەرمایە کە هۆی تەجاوز و جەنگ نەدەبوو.

هەرکەس لە دڵا مەراق و داخێکی هەیە
کێ مەیلی گوڵ و گەڕانی باخێکی هەیە.
١٩٨ بێ کەیف و دەماخم کە لە ژوور نایەمەدەر
خۆزگەم بەوە کاتی گوڵ دەماخێکی هەیە.

ئەو ڕەنیە بە زەبری زێر و زیویان هێنا
ئاهی دڵی مەزڵووم و هەتیویان هێنا
١٩٩ سندووقی لەواسان بوو کە چاو دێری کە ران
بۆ دەردی دوکتۆری فریویان هێنا.

ئەو شوێنە کە زێر و زیوی لێ ببرێ لە ناو
٢٠٠ قەد لۆردی تەڵا پەرست خەوی ناچێتە چاو
ئەو دوورگە کە هەر ئاگری لێ هەڵدەستێ
ئاخ خۆزگە بە دەم باوە بکە و تایەتە ئاو.

کێ گۆشەنشین مایەوە زۆر دڵتەنگە
٢٠١ داخ و کەسەر و دەرد و خەمی هاو دەنگە
قەیرانی هەوەڵ دەورە درێژ خایەن بێ
حاڵی من و تۆ خرا پتریش بێ ڕەنگە.

کاتێ مەلیکێ هەوای مڵك دای لە سەری
٢٠٢ پێی نالە وەفا، بەرگی جەفای کردە بەری
هێندەی لە کرێ گرتە زوڵم کرد تاکوو
وەك مالیکی دۆزەخ هەموو لەرزین لە بەری.

دڵ جۆش و خرۆشی ڕاپەڕینی تیایە
٢٠٣ ئەو شێتە گەلی قسەی حیسابی لایە
نێژۆێ چ دەزانێ ئەوی کەوچك بە دەسە
وا دیارە سەری دیار نیە ئەم هەودایە.

ماڵت هەیە خۆتی پێ لە دوژمن لادە
٢٠٤ بەو سەروەتە پێی ببەستە، دەستی بادە
زۆر داری قەوی بە قەند بخنکێنە برا
تا بۆ شەڕی ئابووری ببی ئامادە.

پێم سەیرە، ئەوەی کە دەستەڵاتی زۆرە
٢٠٥ ژێر دەستی ئەون تەواوی سۆرە و تۆرە
نازانێ ئیدارە گشتی هۆی بەدبەختین
بۆ ئەم گەلە پیشەیان کە زوڵم و زۆرە.

سەرمایەیی پارەدار ئەگەر کار دەکا
٢٠٧ سەر پاکی بە دەستی کارگەر کار دەکا
گیانم بە فیدای دەست و پلی خوێناوی
بۆ بەختەوەری چینی بەشەر کار دەکا

ئاواتی گەلە کابینە زوو سەر بگرێ
٢٠٨ بێدادی بە هێزی عەدڵ و داد دەر بگرێ
تەشکیل بدرێ بەڵکوو بە گوێرەی یاسا
کێ مافی خوراوە مافی خۆی وەربگرێ.

پیری کە ئەوی خزمەتی بۆ دوژمن بوو
دویّ کاری بە ناکەس بوو، کەسی لیّ ون بوو
٢٠٩ ڕۆژی گەشی ئاوات و هیوای ڕەش کردین
ئیمڕۆ کە شوکوور دوچاری دەردی من بوو

هاتبایەوە خۆزگە باوی بەیت و باوم
٢١٠ بکرایەوە ئەمجارە دەمی بەسراوم
با ئەم دڵە شێتە لای خەڵک هەڵڕێژیّ
زووخاوی دەروونی پڕ لە جۆش و تاوم.

سەرمایە لە دەس چوو، تاجران لیّ کەوتن
٢١١ نابووتی پەکی خستن و یەك جیّ کەوتن
دەس گرتنی چی تازە، چی‌یان پێوە نەما
ژێر باری قەرز بوون، لە دەس و پیّ کەوتن.

دەردی‌مە بە بیری نویّ دەوا کەن چاکە
٢١٢ ئەم باوە کە زۆر کۆنە، ڕەها کەن چاکە
پێویستە بە شەلـلاق و شەقەزلەی قانوون
ئێمەش بە وەزیفە ئاشنا کەن چاکە.

ئەو بارە لە بیّ خودی خەڵك نۆشی دەکا
٢١٣ یا گوێی لە قسەی ناکەسە دڵ خۆشی دەکا
ناکامی چی‌یە، عەیب و هونەر نابینیّ
گەر چاك و خراپی دی، فەرامۆشی دەکا.

دوژمن کە بە شوێن دوژمنیا عەبداڵە
بێگانە کە بە زیانی خەڵك خۆشحاڵە
٢١٤ خۆی دۆستی گەلان نیشان ئەدا دەوڵەتی ڕووس
درگاشی لە دۆستەکانی‌دا ون گاڵە.

یەکتر بگرن کار و تەقەڵای کوڕو کاڵ
خۆش ڕادەبرێ بۆ هەموو کەس مانگ و ساڵ
٢١٥ شار داری بە بوودجەی تەسەل و کۆششی خەڵك
نای مێنێ کەم و کووڕی، تەواو دێتەوە حاڵ.

ئاخ خۆزگە لە سەر زمانی گەل مۆر نەدەبوو
٢١٦ داروغە لە حەد بەدەر جەفای زۆر نەدەبوو
نەختێك دەدوام لە باتی بێ قانوونی
نامەم کە زەلیل و دیلی سانسۆر نەدەبوو.

دوێ دەوڵەمەنێك زێڕی لە سەر یەك نابوو
٢١٧ شەو ئاگری فیتنەی لە خەڵك بەردابوو
ئیمڕۆکە بە چاوی عیبرەتی تێ‌فکریم
سەر تا بە قەدەم هەر وەکوو شەم سووتا بوو.

ئەو ڕۆژە لە ئاسمان و زەوی هیچ نەبوو
٢١٨ هەر تاعەتی خوا، بێجگە لەوی هیچ نەبوو
ڕێی ڕاست و دروستی مەعریفەتمان پێوا
هەوراز و نشێو، بەرز و نەوی هیچ نەبوو.

ئازادی برێک لە چارە یا نووسراوە
باقی دی هەموو مریشکی پێ بەسراوە
٢١٩ وێژەر لە چی بدوێ، هەموو گوێی بۆدەگرن
چون ناوی لە مەجلیسا بەزل ناسراوە.

کێ بیری نەخۆشە، ساخ و سالم نابێ
مەحکوومی خەڵك شیاوی حاکم نابێ
٢٢٠ هاوار و هەرا تازە بە پووڵێکە برا
ئەو خائینە خۆپەرستە خادم نابێ.

زنجیرە یەکن، لە هۆزی بێ خێزانن
٢٢١ مێعماری سەرای مەملەکەتی وێرانن
بەو سەروەتی وا زۆر و زەوەند تێر نابن
بە نیازی کرۆستنەوەی گەلی ئێرانن.

ئازادی ژیان کەسانێ دابینیان کرد
٢٢٢ حەزیان لە ڕژانی خوێن و ئەسرینیان کرد
حەقیانە لە ناو گەلان بە سەر بەستی بژین
ئەو قەومە کە ڕاپەڕینی خوێنیان کرد.

تۆفانی مەخوادەکا دەسی بەر خۆدێ
٢٢٣ لەو دەستە نەجاتی بێکەواتێی ڕۆدێ
ئەو کاتە لە سوورایی گەلیشە، خائین
خۆلادە لە دێوە بۆنی خوێنت بۆدێ

ئەو میرە لە ناو دڵی خەڵك جێگیرە
ئاگای لە منداڵ و گەنج و لاوو پیرە
٢٢٤ كێ ئەتڵەسی پۆشی، خوێنی خەڵكی نۆشی
بڵح و چەپەڵە، هەموو كەسی لێ زویرە.

چی هۆیە كە ئێوە فیتنە هەڵدایسێنن
٢٢٥ ڕستەی یەكەتی و برایەتی دەپسێنن
ئەی تاقمی ڕێوی خەسڵەت و چەوت و چەوێڵ
ئاكا بە نهێنی تەرحی نوێ بڕژێنن.

هاواری نییە دڵم لە ژێر باری خەما
٢٢٦ گەش نەبووە لە خۆش حاڵی برێكات و دەما
وەك ڕۆستەمە نێو بانگی لە ئازایەتیا
كێ پشتی لە ژێر تەوژمی ماتەم نەچەما.

هۆی جەهل و نەزانینە كە دڵ ناشادە
٢٢٧ خۆشیت گەرەكە، لە خۆپەرستی لادە
یاسای تەق و ڕەو لە دەس زوڵم پێویستە
پێویست ئەمڕۆ پتر بە عەدڵ و دادە.

گەردوونە چ ئیمڕۆكە، چ پێرێ و دوێنێ
٢٢٨ شادی لە دڵێك بخا، سەدان دەشكێنێ
چون كاری فریودانە لە هەر ئانێكا
دەتوانێ بە هەرچی ڕەنگە خۆی بنوێنێ.

چون خەڵکی وڵاتەکانی تر هوشیارن
زۆربەی بە ڕچەی مەعریفەتا ڕێبوارن ٢٢٩
پارێز لە نەزانین و ڕەچاو کردنی نەزم
بۆمیللەت و مەملەکەت بناغەی کارن.

زانیوتە بە تیری تۆ چلۆن کوژراوم
سەر پاکی دڵم خوێنە وەها پێکراوم ٢٣٠
ئەو خوێنە بە فرمێسکەوە شەوگاری درێژ
دەتکێتەوە تك تك لە گلێنەی چاوم.

ئاخ پەردە لە سەر نهێنی دڵ لاچووبا
میر خۆزگە قسەی هەقی بە گوێدا چووبا ٢٣١
هەر جۆرە سیاسەتێ کە دەوڵەت هەیەتی
ژێر لچ نەخرایە، بۆ گەلیش ڕوون بووبا.

عەدڵی یەکە مەشهوورە بەجێی عەدڵ و داد
ئەی بۆچی کەسێ دادی لەوێ نایەتە داد ٢٣٢
هاوارە لە دەس عەدلیەیی مەنسووری
ئەم خەڵکە هەموو زاڵەیەتی، کوا دڵی شاد؟

قودرەت لە دەسی حاکمی زاڵمدا بێ
عەدڵیە بە موو عەداڵەتی تیا نابێ ٢٣٣
حوکمێ کەدرا بە سوودی یەك دەستە زەعیف
چون دەستی قەوی تێدایە، ئیجرا نابێ.

وریا بە لە تۆنەکەونە شك ئەهلی یەقین
چی هەق بو بزر نەبێ لە چاوی هەق بین
بێ بەڵگە لە ناو مەحکەمەدا سووچ و خەتا ٢٣٤
نەخرێتە مل ئەو کەسانە تاوانبار نین.

کێ ئەهلی خەتایە، بیکەن ئامۆژگاری
گوێ بیس نەبوو، بەر چاوی بخەن ئاکاری ٢٢٥
تاوانی کە هاتە پێ بە گوێرەی یاسا
جورمی چ بوو، دادگا بدا بڕیاری.

ڕێ و ڕەسمی دزێو بێ حەدە لەم نێوە، چ چار؟
گیانم بە مەراقەوە نێزیك لێوە، چ چار؟ ٢٢٦
دار ماڵە ولاتم لە درنج و جن و دێو
یارەب لە گەڵ ئەم هەموە جن و دێوە چ چار؟

هەر کەس کە شەرابی بێ هەقیقەت نۆشی
چاوی لە هەموو بەڵێن و وەعدەی پۆشی ٢٢٧
چی هەق بوو وتم، بەڵام بە داخم دەوڵەت
هەق ناژنەوێ لێم، کپە هۆش و گۆشی.

کێ پیاوە برا، پەردەیی تاوان بدڕێ
ئەسرینی بەتینی دڵ شکاوان بسڕێ ٢٢٨
خۆباوێتە عەدلیە بە شۆشکەی قانوون
دەستی ڕەشی ناپاك و گڵاوان ببڕێ.

هەر ئەو کەسە خۆی تووشی خەتا کاری کرد
بیری گەل و ڕای گشتی خەتا باری کرد
٢٣٩ بێگانە پەرەست وەکیلی بوون، لەو داخە
خۆی هەرچی خەتای کردبوو، ئیقراری کرد.

ئەو تاقمە هێن خەزێنەیان کرد تالآن
حۆجەی بە نەیارە گەل، هەموو دەس والآن
٢٤٠ ئازان لەوە کاری دەوڵەتی حەرراج کەن
ئاکاری سەران بۆتە گەمەی مندالآن.

خوێن دێ لە برینی دڵ، بە تیری ناکەس
٢٤٢ کوشتوومی تەشەر، جەرگی بریم تانەی کەس
دۆستانی قەدیمی زانیان من شێتم
کردیانمە دەرێ لە جەغزەی یاران، بەهەوەس.

ڕۆژێ سەفی دوژمنان ئەشێ بشکێنی
٢٤٣ بێ پسانەوە زەبری گورج و بڕبنوێنی
ڕۆژیکی تریش پاشەکشەت پێویستە
بۆهێرشی توند بەڵکوو بیان خافڵێنی.

شێرانە وەخۆکەون نە بێ ترس و لە مەرگ
٢٤٤ بۆ جوانی پڵنگ کەوڵ کەن و بیکەنە بەرگ
هەرگورگ و درندەیەك بە نێزەی تۆڵە
ورگی چەپەڵی هەڵبدڕن تا دڵ و جەرگ.

خۆش باوەڕی تۆ لە مەستی بیروڕاتە
شادی، بە کەسانی تر دڵی خۆت ماتە
٢٤٥ پێت خۆشە وڵاتەکەت لە هیچ دووانە کەوێ
پەیمانی لە گەڵ نوێ کەوە، ئێستا کاتە.

پێم هیچ نییە دەرکردن و هێنانی وەزیر
٢٤٦ لە جیاتی تەمێی سەخت و سزادانی وەزیر
هەر بۆیە ئەشێ لە پارلەمان داوا کەین
قانوون بکرێ بە ئافەتی گیانی وەزیر.

فەرقی لای تۆ قوڵە زەنگی و حۆری
٢٤٧ ناکەی شەوەزەنگ، جیا لە تیشکی خۆری
هاواری خەڵک ناژنەوی، دیارە کەڕی
چاوت لە ڕووناکی نییە، مەعلووم کۆری.

باسێکە نەدرکاوە، نهێن بێ، چاتر
٢٤٨ ڕازی نەزڕاو بێ سەر و شوێن بێ، چاتر
بۆ کار بە دەسانی مووچە خۆر، سەرمایە
پۆستێکی گرنگ و پڕ ڕمێن بێ، چاتر.

ئەم خانوو ڕەش و شپرزە تا نەفخی سوور
٢٤٩ وەك کوندەبەبوو نیشتووە تێیدا مەنسوور
زوڵمی یە لە ئەسڵایە، بە ناو عەدڵییە
ناویانە بە حۆقە ناوی زەنگی؛ کافوور.

وەربگرە لە پیر تەجرەبە ئەی لاوی دلێر
٢٥٠ دەر بێنە لە چنگی پاڵەوانان شمشێر
گەر مافی ڕەوای تۆ لە دەمی شێردایە
بستێنە بە زەبری شیر، ئەوی مافە لە شێر.

تۆفان وەکوو نەی ببیە نەوایی تەورێز
٢٥١ خوێن بگری لە تاوی بێ نەوایی تەورێز
وەك چەنگ و ڕوباب و نەی بناڵێنە بە سۆز
بدوێ لە پەرۆشی نەینەوایی تەورێز.

سندووقی قفڵ درا و دەری کریاوە
٢٥٢ پڕبوو لە گەمە و حەشر و حەلا ئەم ناوە
ئارای گەلە وا بۆتە مەلی بەختەوەری
کێ نیشتە سەری، بە بەختە، خوا پێداوە.

ئەی دڵ لە شەقامی هەق هەڵێ و مەشترسە
٢٥٣ شوێن ئەو کەسە بگرە هەق دەڵێ و مەشترسە
پاکی بکە پیشەت، وەکوو تۆفان[1] بە، لە لای
بێگانە و خۆیی هەق بڵێ و مەشترسە.

---

١ - تۆفان: ڕۆژنامەی تۆفان.

شەو بێچووە فەلاییێکی کرێکار و کەساس
٢٥٤ هاتبووە کنم تاویّ شرۆڵ و پێخواس
ڕازی بوو لە هێزی شان و دەست و چە کوشی
شوکرانە بژێری مەچەك و باسك و داس.

شازادە کە بوو بە حاکم و ڕابەری فارس
٢٥٥ خوێن ڕێژی بە جاریّ گرتی سەرتاسەری فارس
فارسی هەموو کردە ژێر چەپۆکەی سواران
ئەی داد، بە فارسی لە دەس ڕابەری فارس.

لەم مەملەکەتەی مەڕاپەڕین پێویستە
٢٥٦ ورگی دژی نیشتمان دڕین پێویستە
بۆوەی کەسبەی بە سەر مەبەستا زاڵ بی
ئیمرۆ هەل و مەرجی ڕیّ بڕین پێویستە.

وەك گوڵ نیە دڵ نیازی بە ڕەنگ و بۆبیّ
٢٥٧ ناوی گەرەکە پەسندی خزم و خۆبیّ
فرمێسکی گەشی مەبەستە، نەك ناڵە و ئاە
بۆئابڕوو بەو هیوایە بەڵگە و هۆبیّ.

گویّ کپ کە لە کێشە و چەقەچەق دڵخۆش بە
٢٥٨ هەر چۆنی زەمان گۆڕی وەرەق، دڵخۆش بە
وەك دوێکە بە نوێنەری نەناس دڵخۆش بووی
ئیمڕۆکە بە کابینەیی لەق دڵخۆش بە.

نەورۆزە کەوا پێ و قەدەمی پیرۆزە
٢٥٩ کوڕ گەل هەموو سەرخۆشن و شادی هۆزە
تۆفانە سەمیمانە پیرۆزبایی دەکا
پێشکەش بە کەسێ بۆ گەلەکەی دڵسۆزە.

من نیم بە تەنێ، خەم لەبەر رودڵ بە پەرۆش
٢٦٠ لەم کاولە جیهانەدا نییە کەس دڵی خۆش
کامی بە ڕواڵەت کەمەکێ شاد و گەشە
دار ماڵە دەروونی لە مەراق و کوڵ و جۆش.

ئەی نووکی قەڵەم لە شوێن هەقیقەت وێڵ بە
٢٦١ تا خوێنی دڵت قووتە، هەقیقەت کێڵ بە
گەر سەر ببڕێ لە سەر هەقیقەت وێژی
لێی لامەدە لای دوژمن و دۆس بێ فێڵ بە.

لەم جەنگەڵی دەورانە پڵنگ و شێر بە
٢٦٢ لای ئەهلی هونەر، هونەر نوێنی فێربە
شەو درکی جەفا بچێ بە دڵتا لە چەمەن
وەك خونچەیی بەر بەیان گەش و زەنوێر بە.

ئەی دۆستە عەزیزەکەم لە شەڕکەم بدوێ
٢٦٣ وەك گوڵ بە، لەڕێی ئاشتی خوازان بڕوێ
دۆستانە لەگەڵ کەسێ ژیابی، تاوێ
لەو دۆستە بەموو لامەدە، تا بۆت بلوێ.

داخ و کەسەری زەمانە هێزت نەبڕێ
٢٦٤ لالووتی فەلەك، خەفەت بە بەژنت نەبڕێ
گەردوونی چەوێڵ ئەگەر بشت دا لە زەوی
وریا بە بە گێژ و حۆڵی تاوت نەزڕێ

شەو ناومەتە بەر پێی گوڵی ڕەعنا، سەری خۆم
٢٦٥ دێراومە چەمەن بە ئاوی چاوی تەڕی خۆم
ئەوسا وەکوو مەل، لە ناو قەفەس دا بە مەراق
خۆم خستەوە بن سێبەری باڵ و پەڕی خۆم

نوقمی زەوی فێڵبازی یە مەنسوورولمولك
٢٦٦ هەم موفتی یە، هەم قازی یە، مەنسوورولمولك
کێ زۆری لە دەس هەراس و ناڕازی یە خەڵك
لەو شەخسە گەلێ ڕازی یە مەنسوورولمولك

ئەی ئەو کەسە لە پیاوەتی تۆ دانی یەشك
٢٦٧ گەردوونە لە داخی تۆ دەبارێنە ئەشك
مەمنوونی وەفا و هیممەتی تۆم، لەو دەمەوە
بۆم هاتووە بە دیاری لە لای تۆوە کەشك.

زۆر سەیرە لە لایێ مەجلسی ڕەنگاوڕەنگ
٢٦٨ لەو لاشەوە جێ بە چینی گەلخوازان تەنگ
حاشا لە حوکوومەتی فشار و سەرەڕۆ
هەروایە نیزامی وشتر و گاو پڵنگ

ئەو ڕێویە کەڵەکبازە بە مەکر و حیلە
خۆی کردی لە سەر قەرار بە کێشە و پیلە ٢٦٩
هەر خۆیشی قەراردادی بە مەجلیس مۆرکرد
پێی نا لە حقووق و مافی قەوم قیلە

کابینە کە بەسرابوو بە هۆی گێژاوە
دوێ هاتەوە مەجلیس و دەری کریاوە ٢٧٠
زۆریان لە ڕەئیسولوزەرا کرد، تاکوو
بووژاوە بەڵام بە چەن کەسی دۆڵپاوە

بێ‌ماف و مەعاش و مڵک و ماش و زێڕین
ماڵ کاول و هەڵوەدای نزار و لێڕین
ئەی خاوەنی سەرسەرا لەگەڵ ئێمە مەبن ٢٧٢
لەم کاتەوە ڕاپەڕیو و شۆڕشگێڕین

زانیوتە کە کێ پەسند و خوێن شیرینە
کێ کەکرەیە، خوێنی خەڵکی لێ بەدبینە ٢٧١
هەر ئەو کرێکارە نانەکەی جۆیینە
ئەو کاربەدەسەی کە سفرەکەی ڕەنگینە

دڵ فێری ئەوینداری بووە ڕۆژی بەرێ
وەک شەم دەگرێ، باکی نییە چی بە سەرێ ٢٧٣
تا خاکی لەشی نەدا بە بام ئاگری ئیشق
دڵ نەبووە خەڵووز، قەترە لە چاو نەچووە دەرێ.

ناخۆم لە ژیانم خەفەتی ناوی ژیان
لەم خوانی زەوی مەگەر بخۆم پەنجەیێ نان ٢٧٤
ماوەی تەمەنم خەمی جیهان خواردن بوو
شەرت بێ لەوەلانە خۆم خەم و دەردی جیهان

ڕۆڵەی جەم و کەیقووباد و کەیکاووسین
پارێزەری نیشتمانەکەی سیرووسین ٢٧٥
ڕازاوەتەوە بە خۆر و شێر ئالامان
دەرکەوتوو لە بەندی ئینگلیز و ڕووسین

یەک دەم لە موحیببەت و سەفا لانادەین
قەد گوێ بە قسەی پووچەڵ و بێ جا نادەین ٢٧٦
کێ کەم بوو شعووری، فیز و تیزی فرەبوو
جوابی نییە لای ئێمە، بەنی با نادەین

عومرێکە لە سەر مێهر و وەفا زۆر سوورین
دڵ بێ غەرەز و کینە لە دەعوا دوورین ٢٧٧
چۆکمان لە بەرانبەری عەدالەت دا دا
یاسا چی یە؟ حوکمی گوێگری دەستوورین.

هۆی چارەرەشین بۆ گەلی ئێران؛ دووکەس
ئەم واتەیە روونە بێ گومان، بۆ هەموو کەس ٢٧٨
یەك: نۆکەری ئینگلیسی نامەردە؛ وسووق
یەك: ڕووسپی دەربارە؛ قەوامی ناکەس

رۆژێ کە، کە ئێرانی ئەشێ هیممەت کەن
بۆ تاقمی بێگانەپەرست هەڵمەت کەن
ئەو کۆشك و سەرایە گورگی هاری تیایە ٢٧٩
وێرانی کەن و خاوەنەکەی مل پەت کەن.

وەك سەروی چەمەن بەرز و بە سێبەر خۆمم
بۆخاکە نسێم، بێ سەمەر و بەر خۆمم ٢٨٠
هۆی راست و دروستی مەکە رووت وەڕەبەنم
دەس تەنگ و نەدار بێچووە سواڵکەر خۆمم

زۆر شێوێنی گرنگ لە مڵکی دنیا چوومە
لە خراپ و لە چاك و وشك و تەڕ، بیستوومە ٢٨١
سەرمایەیی ژین خڕوپتوونی ئەمەبوو
زۆر شت کە نەبینراوە بە چاو، دیتوومە.

عومرێکە بە داوی ئارەزوو بەسراوین
بۆئەهلی هەوەس رێبەر و خاوەن ناوین ٢٨٢
ئێستا لە نەکاو بە دووی مەرگدا وێڵین
چونکی لە تەمەن زیز و لە ژین تۆراوین

هاکا لە کوڵی دەروون دڵم چوو بە هیلاك
چاوی تەڕە کردوومی کەساس و خەمناك ٢٨٣
ئەم ئاگر و ئاە و ئاوی چاوم باقین
تا رۆژێ بە توندە بای ئەجەل دەبمەوە خاك

سووڕامەوە وەك با بە هەموو دنیادا
٢٨٤ یا چەشنی شەپۆڵ، خۆم لە هەموو جێگادا
یەك قەترە پتر نەبووم، بەڵام خوێنی دڵم
هێنن خواردەوە تا چووم بە دڵی دەریادا

ئەو مەنجەڵە دایم دەکوڵێ، دیارە منم
٢٨٥ ئەو دیلی قەفەس، مات و خەفەتبارە منم
دوور کەوتوو لە کۆڕی هاودەم و یارانم
ماڵ کاوڵ و کۆڵ بە کۆڵ و بێچارە منم

ئەو رۆژە قسەی عیشقی بە گوێدا چوووە دڵ
٢٨٦ گەوزیوە لە خوێن، دڕکی بە پێدا چووە دڵ
هێند پاییزی سەخت و نامرادیم دیوە
سەد جار بەهار هات و نەپشکووتووە دڵ

لای دوژمن ودۆست ئەگەر نەرم بێ وەکوو مێو
٢٨٧ وەك نەخشی نەقیم نەبی، شەرم بی وەکوو مێو
لای دوژمن ئەشێ گەلێ سەخت تر بی لە بەرد
لای دۆستی بە راستی دڵ نەرم بی وەکوو مێو

دوو روویی نەکەم شەرتە لەگەڵ نەوعی بەشەر
٢٨٨ لای راست و دروست درۆم لە دەم نایەتە دەر
عادەتمە لە وردە عەیبی خەڵکی دەدوێم
ئەمما بە نەفامی هێرشی ناکەمە سەر.

ئەو رۆژە کە رێی شادی و گەشی خەممان بەست
دەرکی هەموو نامەحرەم و مەحرەممان بەست ٢٨٩
دادم کە بە هیچ کوێ نەگەیی، بێ دەنگ بووم
کەسمان کە بەهاناوە نەهات، دەممان بەست

تا بەو هەموو رەنجە فێری بووم دەرسی ئەوین
خەرمانی تەمەن تێی چوو بڵێسە و گڕو تین ٢٩٠
بێ تیشکی شەمی روومەتی تۆ، ئاگری خەم
سووتاندی لەشم چەشنی پەپوولەی مسکین.

زۆرم لە دەمی راست و دروست داوە بە مشت
پەنجەی چەپەڵم گەلێ لە ناو شیردا شۆشت ٢٩١
لەو داخە کە رۆیی ئابڕووی کیشوەری جەم
ئاوری عەرەبم خستەوە خاکی زەردەشت

ئاورێکی بەتین لە رەنگی ئاسۆ دیارە
ئاژاوەیە کە جیهانی تیا بەشدارە ٢٩٢
وەیشوومە کە قەیرانی بەسەرچوو دنیا
سەر پاکی بەرەو خۆشی دەچێ ئەم جارە.

عومرێکە لە چەشنی بایە قوش دەخوێنین
بێزاری لە ژین دەردەبڕین، واز دێنین ٢٩٣
مەرگی کوت و پڕ پەسندە، نەك ژینی بەژار
تاکەی بە جەفاوە، سیل و دیق هەڵبێنین

رۆژێ بوو دەماندا تەشەر و تانە لە تاج
٢٩٤ دەس خاڵی لە ژێر پێ لە قەنا، تەختی عاج
رای کرد لە دەسی من و دڵم، تالیعی بەخت
هاوارە لە دەس بەختی رەش و خەرج و باج.

چون ئێمە لە سەرویست و مەرامی باشین
٢٩٥ گوێ کپ لە دروشمی رێبەرانی ناشین
هاتووینە جیهان، بە بت شکێنی فێرین
تا نێعمەتی ژین باقی یە، بوت ناتاشین

گەر بەختی خەواڵوو بەربەیان هەستێنین
٢٩٦ با ئاگری دڵ بە ئاوری رەز دایسێنین
چل رۆژ بخرێینە قوژبنی مەیخانە
هەر بادە وەخوێن و واز لە دنیا بێنین

ئەو رۆژە کە وەك سەرو لەگەڵ دەرکەوتم
٢٩٧ دەس خاڵی بە پێ لە ئاسمان سەرکەوتم
دیم هۆزی مەلان، لە چیمەنان دڵتەنگن
گیانم وکوو خونچە دادڕیم، وەرکەوتم

ئەو شینکە کەلەم چیمەنە تۆراوە، منم
٢٩٨ ئەو لالە کە نوقمی ئەشك و خوێناوە، منم
ئەو خونچە گوڵەی کە سەد بەهار هاتن و چوون
هەرگیز نەگەشاوە، لێوی بەستراوە، منم.

وەك سەوزەگیا، رۆژێ سەرم هێنادەر
وەك لالە دەروون پڕ لە خەم و سەوداسەر
کاتێ وەکوو خونچە خۆم بە دڵتەنگی دی ٢٩٩ ٣٠٠
ئەوسا کە دڕیم بەرگی ژیانم یەکسەر.

هەر سەردەمی لاوی بوو کە روانیم پیرم
پێشێلی قەزاو بەڵا، نیشانەی تیرم ٣٠١
ئەی عومر بڕۆ، بە راستی ماندووت کردم
مردن وەرە، تێر بووم لە ژیانم، زویرم.

هەستین کوڵی دڵ بە جامی مەی بڕژێنین
دڵ کەیلە، پەنا بۆ چەقەنە و نەی بێنین ٣٠٢
چون ئەهلی ریایە هەرچی دڵ دەشکێنێ
شووشەی دەغەڵی وڕیا بە بەرد بشکێنین.

تا کەنگێ بخوێنن ئێمە خەمی بێهوودە
شوێن کەوتنی ئاواتی نەفس بێسوودە ٣٠٣
قەد نەبووە لە ماوەی تەمەن ئاسوودە بژین
مردین کە لە دەستی خەم ببین ئاسوودە.

تا سەر بە هەنیسك و لێو بە بارم، خۆشم
تا دڵ بە خەم و رووت و هەژارم، خۆشم ٣٠٤
خۆشی و گەشییان خەڵکی لە دەرمان گەڕەکە
من تاکوو نەخۆش و دەردەدارم، خۆشم

پێم خۆشە عەیش بە بێ مەراق و کوڵی دڵ
تۆڵەی زوو لە داماتوو وەکەم بێ کەم و کوڵ ٣٠٥
بای دەردی و بەلا و موسیبەتم لێ بگەڕێ
تیر پێ دەکەنم بەیانی یەك زوو وەکوو گوڵ

شێرم بە زگی برسی کز و داماوم
چوار دەوەرە بە زنجیری جەفا بەستراوم ٣٠٦
خوێن خۆرییە بەشمان لە دەسی دوژمن و دۆس
تا شەڕبوو بە شیری رووتەوە وێستاوم

پێت خۆشە کە هاوشانی هەموو دنیا بین
پێویستە بە کردەوە و عیلم وریا بین ٣٠٧
مەشهورە کە بەندەیی و نەزانی خزمن
هەر بەندە دەبین، مەگەر تەواو زانا بین

عومرم بە فشاری خەم گەلێ راماڵی
سەبرم کە کراسێك بوو لە بەر داماڵی ٣٠٨
ژین بۆمە مەرگ بوو لەم جیهانی پڕ دەرد
پێم سەیرە کە ناوی زیندەگیم ناپاڵی

ئەو رۆژە لە دەستی تۆ شەرابم نۆشی
پێم نا لە فەلەك لە بەر وڕی و بێ هۆشی ٣٠٩
بێ خەم بە کە پشتی هەر دوو پێم دا لە جیهان
لێم روونە کە تێیدا نییە خێر و خۆشی.

ئــەو رۆژە مـــن و دڵ لـــە دايـــك زاويـــن
٣١٠ دايـم بـە فـشـارى دەرد و خـەم ژاكـاويـن
لـەم بـەحـرى جيـهـانـە پـڕلـە داوو تـەڵەيـە
ئازادى‌يـە ئـازادى چـى، مـاس و ئـاويـن.

تـا پـێم لـە سـەرى تـەمـاح و بـريـا داوە
٣١١ هـەر لـێو بـە بـزەم، گـەپـم بـە دنيـا داوە
لـەم گـەمـيـە شـكـاوەدا كـە پـەرتێ نـەدەكـا
شـادم كـە دڵـم بـە نـاخـى دەريـا داوە.

لەو رۆژەوە پـێم نـاوەتـە مـەيـدانـى ژيـان
٣١٢ پـێش هـاتـنـەكـەم بوومەتـە هـاوشـانـى ژيـان
چون تەختى فـەلـەك شيـاوى من نەبووە لە زوو
كەوتوومەوە كـا و لـە كـۆن و زيـنـدانـى ژيـان

ئـاڵايـەكـى ئـاشـتـى بـەرز بـێ لـە جـيـهـان
٣١٣ ژيـنـى وەكـوو يـەك سـەر بگـرێ بـۆ هـەمـوان
بـۆ بـەخـتـەوەرى بـەشـەر بـنـاخـەى كـارن
لـەم دووانـە بـەدى دێ هـەموو ئـاواتـى ژيـان

لـەو رۆژەوە كـردمـانـەوە لاسـاى مـەجـنـوون
٣١٤ دەسـمـان شتەوە لـە عـەقڵ و زانسـت و فنوون
بووم سەنـدەوە نێچيـر لـە دەمـى شێر، ئەمـمـا
كەوتينەوە داوى عيـشـقـى تـۆ، ديل و زەبـوون

گەر ئێمە لە بیری نوێنەری خۆش خوو بین
بۆ دەوڵەتی خۆڕاگر ئەشێ ماندوو بین
رابردوو کە رابردووە، ئێستەش کوا هەل ٣١٥
وا باشە هەموو لە بیری داهاتوو بین.

هەرچەندە لە بیرمە هێمن و لاشەڕ بووم
هەق وێژی سەبەب بوو تووشی کێشەو گەڕ بووم
لاڵ بووم لە مەراقا کە نەبوو گوێ ی بیستن ٣١٦
هاوار و هەرا ئەوەندە زۆر بوو، کەڕ بووم

هەر چۆنی کە بۆمە دەس بدا، رێ دەکوتین
زۆر هێدی بە بێ دەنگ و سەدا رێ دەکوتین ٣١٨
بۆوەی نەکەوینە قوولکە جارێکی تریش
ئەمجارە بە گۆچان و عەسا رێ دەکوتین.

ئەو رۆژە کە تووڕە بن هەموو چینی هەژار
مل هوڕ ئەدەنە بەر تەشەر و تەوس و پلار ٣١٩
کێ تێک دەری یاسایە، ئەگەر مەنسوور بێ
ئەم تینەرە پێچەکی ئەدەن بۆ پەت و دار.

جەغزین لە ژماری زۆر و کەم باخەبەرین
ئاوێنەیی بەزم و نەزم و عەیب و هونەرین ٣٢٠
تۆ دەوڵەتی دەوڵەمەند و لۆردت گەرەکە
ئێمەش لە خەمی ژینی گەلی قوڕبەسەرین.

قەت گاڵتە بە قەدر و ڕێزی مەردی ناکەین
٣٢١ وەك با هەوەسی جیهان نەوەردی ناکەین
ئەمما چ گوناهیش نییە لای چاك و خراپ
بڕواکە بە دەستەڵاتی فەردی ناکەین.

لەو داخە کە من لای ئەم و ئەو بێ قەدرم
وەك شەم بە بڵێسەی کڵی دڵگر ئەگرم
٣٢٣ بێ سەبری ئەوان گشتی قسەو ئارەزووە
هەر من بە هومێدی کردەوەم تا ئەمرم.

باسی شتی کۆن دەکەم لەگەڵ دەوڵەتی نوێم
٣٢۴ عادەتمە لە عەیبی خۆم و خەڵکیش دەدوێم
چی نەمدی بە چاوی خۆم، کپ و لاڵ و کەڕم
چیم دی بە کەسێکەوە لە سەر ڕێی دەڕوێم

ئـ

ئاوقا: تێکەڵ بوون، تێکەوەگلان؛ گلاویزشدن.

ئاواڵ: دۆست، هاورێ، رفیق، دوست.

ئەمەگ: ئەمەك، وەفا، پیاوەتی، رەنج و ئەرك، نیکی، وەفا، رنج.

ئەتوار: رەوشت و کردەوە؛ اخلاق و رفتار، اطوار.

ئەوحەلە: ئەوکاتە؛ آن هنگام

ئاژوو: ئاژۆ، لێخوڕ، شوێن هەڵگرتن، لك لێبوونەوە؛ راننده، ردیابی، ریشەدوانیدن

ب

باوەشە شووشکە: باوەشە چیلکە؛ یك آغوش هیمە و هیزم.

بنەگوێی: بنەگونی؛ زیرگونی.

بێزەرە: بێزیان؛ زیان ندیدە.

بێریانی: مەڕدۆش؛ شیردوش.

بزۆزان: بێئۆقرە؛ بی‌آرام.

بە یداغ: ئاڵا؛ پرچم.

بۆسو: بۆنی لۆکەی سووتاو، پەڕۆی تازە سووتاو؛ بوی پنبەی سوختە، تکە پارچەی تازە سوختە.

باسك: لە جومگەی دەستەوە تا هانیشك، ملەی کێو، دارجگەرە؛ ساعد دست، بازو، ستیغ کوە، چوب سیگاری

بۆز: شینی ئاماڵ سپی؛ ریشی ماش و برنجی؛ نەخۆشی چۆکی ئاژەڵ؛ کبود، ریش جوگندمی، نوعی بیماری دام.

بلّق: پۆرگی ئاو، دەنگی کوڵینی ئاو؛ حباب آب، صدای غلیان‌آب.

بسك: ئەگریجە، پرزەی سەر بەرگی گەنمەشامی؛ زلف، کاکُل ذرت.

بژار: گیای خراب، خۆدۆزین، ژمار، وجین، خودجستن، شمارە.

بنکۆڵ: له بنەوه هەڵکەندنی دیوار، دانەوەی بنی رەز و تووتن، کندن دیوار از بن، گود کردن بُن مو و توتون.

بژوێن: زەمەند؛ زمین پرگیاه و علف.

بەبارِ: بەبرِ، بەزاکوون؛ آدم کارآمد. بارِ: بێچووەمەلی بەهارە؛ جوجەی بهاره.

بۆسه: کەمینگا.

بەتلان: له بەین چوون، نەمان؛ از بین رفتن و از کار افتادن.

بوولەرزه: زەلزەله؛ زلزله.

باستیل: باسوخ، باسوق، باسوز؛ باشلُق.

بییه: بییسه.

بلّح: رەوشت ناشیرین، هەرزه؛ هرزه، ابله.

بژوێن: زەمەند؛ زمین پر از گیاه و علف.

بیزا: گیایەکی به ناوبانگه بۆ ترشیات و بۆناوشیرێژ به کاردێ؛ گیاهی خوشبو مشهور است.

## پ

پێوەن: زنجیری قاچی ئەسپ و بەندی، پەیوەند؛ شکال، پیوند و علاقه.

پێتاو: پێ پۆش، کاڵه و زەنگاڵ؛ پاتابه.

پیاس: قەدەم لێدان، راوێچکه؛ قدم‌زنی.

پەتا: نەخۆشی گیرۆ، ئاهۆ، پەسیو، هەڵامەت، نیوەنمەك و شەڵتەی گەرمی سەربرین؛ واگیر، زکام، ضماد گرم که بر زخم می‌نهند.

پیت و پێز: کیش و هێز؛ کش و تاب.

پەرەسلێرکه: پەرەسیلکه؛ پرستو.

پیسکه: رەزیل، چروك، رژد؛ خیس.

پەسن: پێهەڵگوتن؛ ستودن.

پتیۆڵ: لێزان، زانا؛ فیلسوف، دانشمند.

پێ‌کوڵ: پێ‌کورت، درکێکی سێ‌سووچە؛ پاکوتا، خارخسک، سەکوهك.

پەڕیوە: ئاوارە؛ آوارە، سرگردان.

پەرشە: پەڕشت، کاوکۆتی دانەوێڵە؛ پراکندە، از انواع حبوبات.

پەیاخ: داشی شەترەنج؛ بیدق شطرنج.

پەڵە: لەکە، بارانی تێری دەخڵ، پارچەزەوی، لەزوپەلە؛ لکە، باران پاییزی، قطعە زمین، شتاب.

پۆز: کەپۆ، لووت، دەم و لەوس، زەنبوورەی ئاش، کونی قنگ؛ بینی، نِس، سوراخ تنگ آسیاب، مقعد.

پەین و پاڵە: گووی ماڵات، کوت؛ مدفوع ستور، کود.

پلپڵە: پپڵە؛ زیور زنانە.

پێگە: کۆمەڵگای چەتە و سوپا، بەرپێی ماڵات لە تەوێڵەدا؛ پایگاە، پهن کفِ اصطبل.

پلار: داردەستێ کە بۆ هاویشتن دەبێ، قسەی بە تێکوڵ، تانە؛ تکە چوب، متلك، سرزنش.

ت

تا: هەودا، تاڵ، لکەدار و گیا؛ تارنج و مو، شاخە، تب.

تۆرمە: رەچەڵەك، بنەچەکە؛ نژاد، نسل.

تەپکە: داوی راوی مەل، دموە، تەپاڵە، پنجە گیا، نوعی دام، تلە، تاپالە، بوتە.

تەشەنە: کێم و زووخاو هێنانەوەی برین، گرتنەوەی زیادکردنی کوان و زیپکە؛ چرك زخم، سرایت زخم.

تەزی: سڕبوو، سارد؛ بێ‌حس، سرد.

تەسەل: تێر؛ سیر.

تۆسن: سەرکێش، نائارام؛ اسب سرکش و رام نشده.

تووڕ: هەلوك، توورەکە، ترپ؛ خورجین، تُرُب، چوب کوچك الك و دولك.

ترووسیان: ترووسکان، بریقەدان، تروکانی چاو؛ درخشیدن، پلك زدن.

تلاسان: لە ڕێگەکلابوون؛ منحرف شدن.

ترۆپك: دوندی کێو، بڵندترین شوێنی‌دار؛ قلەی کوە، نوك بلندترین شاخەی درخت.

تۆرە: شەرم، حەیا، منداڵی هەوێ، زانست؛ آزرم، فرزند هوو، دانش.

تاوڵ: چادر، ڕەشماڵ: چادر.

تێکی‌کەوە: بیشکێتە بە سەریەکا.

تەسەن: تەبەکی نان، تەشتی هەویر شێلان، کۆسپی سەر ڕێگە، هەڵەنگووتن؛ طبق‌نان، تشت خمیر، دست انداز راە، سکندری.

تەشەن: کێم و زووخاوهێنانەوەی برین؛ چرك و سرایت زخم.

تەوەزەل: تەمەڵ، تەپ، لەش گران، تنبل.

تەتە: بووکەڵەی منداڵان، پوور، مەت، پەلە، خێشك بۆزموی لووس کردن؛ عروسك گلی، عمە، بزَن.

## ج

جاڕز: هەراسان؛ هراسان.

جدمو: لە کار کەوتوو، وڵاخە بەرزەی پشت بریندار، شانی زامدار؛ از کار افتادە، بارکش، پشت ریش.

## چ

چەتفە: دەسماڵی سەری تاتەکان، دستارتازی‌ها.

چەوێڵ: چەوت، خوار، لار؛ کج.

چووکە: چیلکەدار، سووچ و قوژبن؛ چلیکە، گوشە.

چەو: ورتکە بەرد، زیخ، خیز، چاو؛ شن، چشم.

چزوو: نوکی باریکی کلکی دووپشك و مێشەنگوێن و... نیش کژدم و زنبور و ...

چیغ: پەردەی لە قامیش کە بە دەوری رەشماڵ‌دا رای دەنگێون؛ چیغ.

چنۆك: چڵێس. چکووس، چاو نەزێر، تەماکار؛ آزمند، حسود.

چڵووك: ترۆپکی دار؛ بالاترین نقطەی درخت.

چاو نەزێر: بە ئێرەیی، چاو چنۆك؛ حسود، خسیس.

## ح

حەشیمەت: جەماور؛ جمیعت.

حەشەم: دژوار، سەفت؛ دشوار، سەخت

حۆجە: ئاتاج؛ احتیاج.

## خ

خەدەنگ: تیری راست؛ تیر راست.

خودان: خێو، خاوەن، خودا؛ صاحب، خدا، بزرگ.

خێو: خاوەن، جنۆکە، راهێنان؛ صاحب، جن، پرورش دادن.

خەشیەت: فێرەکار نەکراو، ناشی؛ ناشی.

خسۆك: خۆمراندن، خۆکزکردن؛ خود را بە مردن زدن.

خووسان: لە ئاودا نەرم کراو؛ در آب نرم شدە.

خەڵووز: رەژی، رەژوو، زووخاڵ، کۆمر؛ ذغال.

## د

دزێو: ناحەز، ناشیرین؛ زشت، بدگل.

دارماڵ: پڕپڕ، له سه‌ر لێو.

دۆڵپا: دێوێکی چیرۆکان، بڕێتی له ده‌س هه‌ڵنه‌گری؛ دیو افسانه‌ای، کنایه از دست بردار.

دیوه و ده‌ر: دیوانده‌ره؛ از دو طرف سوراخ شده.

داج: بزووتنه‌وه؛ جنبیدن

داپلۆخان: پێست فرێدان له سووتان؛ سوختن و از بین رفتن.

ده‌لال: جوان و خوێن شیرین؛ زیبای دلکش.

ده‌سکه‌نه: دروێنه و رنینه‌وه‌ی گیا به ده‌ست؛ درو با دست.

ده‌س واڵه: ده‌س به‌تاڵ.

دنه: دنته، په‌راسوو؛ دنده.

ده‌میاڵ: شانی چیا؛ ستیغ کوه.

## ر

رندوو: رنوو، که‌ویه به‌فر، کلێڵه؛ بهمن.

ره‌دڵ: جێگه‌ی سه‌من و به‌رداوی چیا، ره‌وه‌ز، رداڵ، جای سه‌خت سنگلاخ، پیرهوسباز.

رژد: هه‌ر رازی کوور، چرووك، زل بوون؛ سربالایی سخت، خسیس، رشد.

راساك: شوێنی ته‌خت، خه‌تی راست؛ زمین هموار، خط مستقیم.

راموسان: ماچ کردن، بوسیدن.

ره‌و: هه‌ڵاتن، باز، ره‌ف، حه‌په‌ی سه‌گ؛ فرار، پارس سگ.

## ز

زوانه، زومانگ، کاغه‌زی مره‌که‌ف مژ؛ خشك کن.

زه‌رده کیفار: گیایه‌کی به‌رزی دڕکاوی: گیاهی خاردار.

زەل: قامیش، چیت، گیایەکی سێسووچە، باتڵاغ، خکیسك؛ نی، گیاهی که در باتلاق می‌روید، باتلاق، لیزگاه.

زەلکاو: باتڵاغ، باتلاق.

زەللە: زراوی گیان‌دار، زللە، ژاڵە؛ زهره، سیلی خرزهره.

زورهان: زوورك؛ تپەی کوچك درهامون.

زموەند: فره، زۆر؛ زمین پر گیاه، زیاد، بسیار.

زەنوێر: جێگەی بڵندی هەوا سازگار، بلندی خوش آب و هوا.

زلهۆڵ: پیاوی درێژ و زۆردار؛ مرد دراز و زورمند.

## ژ

ژینەوە: ژیانەوە؛ زندگی.

ژەقنەمووتە: زەقنە، هەرەتاڵ؛ بسیار تلخ، زهر.

ژاڵ: ژار، کون، جێ؛ زهر، سّم، جای، لانه.

## س

سوور و سات: ماڵیات.

سوورەنگ: سۆرنگ، رەگی گیایەکە بەن و خامی پێ‌سوردەکەن، رۆنیاس؛ روناس.

سەر بزێو: سەر بزۆك، برێتی لە ئەشقی، یاخی، ناآرام، کنایه از متمّرد.

سەرلەند: کاتێ دەس پێ‌کرانەوە؛ شروع هنگام.

سووچ: تاوان، گوناە، گۆشە؛ تاوان، گناه، گوشه.

سوکر: پێسیر، مل، گەردن؛ گریبان، گردن.

سەهلی: ئاگاداری: آگاهی.

سیخوار: سیخ چوولە، پەڵخۆر، جاسووس: سیخول، کاه بلعیده شده، جاسوس.

سوڵتاغ: زاخه، کوول، کویل، زاغه.

سەحەت سووك: ساغی، تەندروست، ئاسوودە؛ تندروست، آسوده.

سۆرە: منداڵی هەوێ بۆژنی هەوێدار، جزمی بەمل داهاتووی ڕەزاگران، جـورێ هەنجیری سوور؛ بچەی هوو، فامیل مزاحم، نوعی انجیر قرمز.

## ش

شەوەزەنگ: شەوی زۆر تاریك و ئەنگوستە چاو؛ شب دیجور.

شیناوەرد: چیندراوی هاوینە، شیناتی؛ کشت صیفی.

شێوەرد: زەوی کێڵدراوی دانەچێندراو؛ زمین شخم‌زدەی قبل از کشت.

شلوێ: شلوو، لیڵ، آب کدر.

شۆشکە: قەمە؛ قمه.

شۆفار: زمان شڕ، نێوان تێکدەر، جاسوس؛ دو به هم‌زن، سخن‌چین، جاسوس.

شینکە: گیاو گژی تازە سەر دەرهێناو؛ سبزەی تازە بردمیده.

شەویلکە: شەویلاك؛ آرواره.

شووڵە: جەواڵ، تێر، گیای دەڵا؛ جوال دوتایی، گیاهی است.

شەنەوشان: شەن؛ افشون، با چنگك درو کردن.

شڵك: ناسك و تورت، بان مەڵاشوو، سست و لەش گران؛ نازك و ترد، آهیانه، سست و گران، خیر.

## ع

عەودالّ: ڕەبەن، هەڵوەدا، ئاودەڵ؛ خانه به دوش، دڕاج‌نر.

## غ

غەڵبەنگ: عەربەنگ؛ گیایەکە تۆمێکی وردی وەك تۆم خاشخاش دەگرێ: گیاهره.

## ف

فرۆ: فرشك، ژەك؛ آغوز.

## ق

قاقم: بوونەوە رێکە لە تیرەی سمۆرە و سنجاو؛ قاقم.

قەڵەشت: قەڵشت؛ شکاف، درز.

قەیران: بەڵێن بۆکات دیاری کردن، جەنگەی توند و تیژی نەخۆشی؛ میعاد زمانی، بحران بیماری.

قەرەبوو: بژاردنەوەی زەرەر و زیان؛ تلافی، جبران خسارت.

قەڵبەزە: شەپۆلی ئاوی چەم؛ تافگە؛ موج رودخانە، آبشار.

قەڵسە: وەڕەز، جاڕز، تووڕە، داڵگۆشت، ترسەنۆك؛ پکر، خشمگین، لاغر، بزدل.

قوولکە: چاڵایی زەمین؛ چالە.

قەشمەر: گاڵتەجاڕ، جۆرێ مەیموون، کەسێ مووی پێش سەری هەڵپاچرابێ؛ مسخرە، نوعی بوزینە، کسی کە موی پیشانیش صاف قیچی شدە باشد.

قالۆر: ساقەتەگیای وشکی ئەستووری ناو بەتاڵ، ئێسکی لوولاك؛ ساقەی گیاه خشك کاوك، استخوان ساق.

قەناسە: زەمینی خێچ و خواری لایەك تەسك و لایەك پان، دەورو بەری ماڵ؛ زمین کج، برف انداز خانە.

## ك

کەماو: سەرچاوەیەك کە ئاوی زۆر نەبێ، چێشتی گۆشتاوی خەست؛ چشمەی کم آب، یخنی؛ آبگوشت غلیظ.

کوڵوو: بنەتاڵوو، هەویری سووتاو؛ ریشەی گیاهی کە بە جای هیزم بەکار می‌رود، خمیر سوختە در تنور.

کوێله: بەندە، بردە.

کوێچکه: کۆچکه، کۆچك، سەرپۆشی زارۆك و ژنان، کەوچك، مێلاك؛ سرپوش کودکان و زنان، چراغ حباب‌دار ویژەی شکار شبانەی پرندە، قاشق

کۆش: تەقالا، سەر هەردووك ران؛ کوشش، بر، آغوش. عضو تناسُلی زن.

کۆتەڵ: کۆتل، دۆڵامنی لە بەرد، کۆترە باریکە، اسبی کە در ماتم می‌گردانند، ناوسنگی آسیاب، قمری، کُتَل.

کەکرە: گیایەکی زۆرتاڵ؛ گیاهی تلخ.

کۆژە: پێسیر، ئێخە، بەروو؛ گریبان.

کەوکوڵ: کەم و کاست.

کۆگا: بە سەر یەك‌دا کراو، دوکانی وردەواڵە؛ بر هم انباشتە، مغازە.

کۆل: تێلەکە، سەرشان، ئاژەڵی بێ‌شاخ، بێچووی دڕندە و ئاسك؛ کولەپشتی، میان شانە،

کەند: قوولکە، ئاودڕ، تەپۆلکە؛ چالە، آبکند، تپە.

کەلۆێ: کەڵپە، ددانی پێشین؛ کلۆی چکۆلە؛ دندان پیشین، قربوس، کلوخك.

کەوڵ: پێستەی مەڕو بزن و هەر بوونەوەرێ، سفرەی چەرم، کورك؛ پوست حیوانات، سفرەی چرمی، پوستین.

کەلان: جوانی تەواو، دەلال، کولێن؛ زیبای بی‌نقص، جوشیدن.

کەزی: پرچ، زلف، قەوزە، جەگەن، بناری چیا؛ گیسو، خزە، گیاهی است، کمر کوە.

کرێوە: بەفری بە باوە؛ کولاك.

کەڕەسیە: کلوە بەفری تەنکی ورد، کەڕە؛ دانەی برف ریز سبك.

کرۆستەوە: کڕاندنەوە؛ لخت کردن استخوان با پوستەی چیزی با دندان.

## گ

گەمیە: گەمی، کەشتی، پاپۆڕ، کشتی.

گەڕ: سوورانەوە، ڕۆیشتن، فێڵ، تەشقەڵە؛ چرخیدن، رفتن، حیلە، شلتاق.

گزی: فێڵبازی.

گلۆر: بازنە، گرۆڤەر، خلۆر، جاریٚ لە جاران؛ النگو، مدوّر، غلتیدە، دم.

گابۆڕە: شین و قیری‌گا، شین و گریان بە دەنگی بە رز؛ صدا ی گاوها هنگام دیدن خون گاو ذبح شدە، شیون و گریە با صدای بلند.

گەدە: جێگەی ریخۆڵان، لە ناوك بەرە ژێر تا سەرڕان؛ شکمبە، از زیر ناف تا ران.

گۆوەند: گۆبەن، گۆڤەند؛ شادی، سرور.

گەوە: نیوە جەغز، قەداوقەدی کێو، بڵندی و نزمی؛ نیم‌دایرە، کمرەی کوە، بلندی و پستی دشت.

گەمە: یاری، بازی.

گەرج: کەرچەك؛ کرچك.

گڕاوێژ: ئاویٚ کە گازی هەیە، بە بڵێسە کراو؛ چشمەی آب معدنی، شعلەور.

گەزارە: زمانی درێژ؛ زبان دراز.

## ل

لاسار: گویٚ نەبیس، سەرسەخت؛ حرف نشنو، لجباز، سرسخت.

لەند: بەرزایی زەوی، بڵند؛ زمینی کە آب اطرافش را گرفتە، بلند.

لێڕ: لێڕەوار، دارستان؛ جنگل.

لێشاو: ئاوی زۆر بە تەوژم، زەحف؛ آب زیاد با جریان شدید، کنایە از فراوانی.

لووزمو: خزینی شتی ورد بە پڕایی، دەرچوونی ئاو لە کون و قەڵشتەوە بە تەوژمی، سواری زۆر و بە پەلە؛ ریزش دانە، ریزش آب با فشار، گروە سواران.

لیتاو: چڵپاو، قوڕاو، لجن، گِل.

## م

مل پەت: خنكاندن.

مەيلە: ئارەزوو، ئاوات؛ آرزو.

مەندۆك: گيايەكى كوێستانى؛ گياهى كوهستانى.

مۆخ: مژى، هێڵەگ؛ مغز، نخاع، الك.

ماك: ريشه، ئاسۆ، رەگەز؛ ريشه، افق، نژاد.

مەن: خاوەن، ئاوى راوەستاوى بێبزوتن، مەندۆك؛ صاحب، آب راكد، گياهى است.

مرومۆچ: رووگرژ؛ اخمو.

مەنديل: شاشل، پێچى سەر، دەسەسر؛ عمامه، دستمال.

مەتاڵ: قەڵغان؛ سپر.

مووره‌شينه: كانزايەكە بە رەنگى شينى توخ، بۆدەرمان دەشێ؛ زاج كبود.

ماڵات: ئاژەڵ، وڵسات؛ دام.

مشته: ئامرازى چەرم كوتانى پنبەچى، كوتكى هەلاجى، مشتو، دەسپەڕ؛ مشتەى كفّاشى، چك پنبەزن، دستەى كارد، استمنا.

مەڵۆ: مەلوو، لۆدەى دەخڵى درواو؛ تودەى غلەى دروشده.

مەڵەغان: داسێكى درێژ، داس بلند.

مەند: خاوەن، مەندۆك؛ صاحب، آب راكد، گياهى است.

## ن

نووا: ئەنوا، ئەشكەوت، پێشەوە؛ پيش، پناهگاه باران، غار.

نەقوستان: تقورج؛ نيشگون.

نسێ: سێبەر، نسار؛ سايه، جاى آفتاب نگير دركوه.

نواڵە: نزار، دەسکێ لەگەڵا و گیا، نانی مفتێ؛ درەی کوچك درکمر کوە، یك دستە از گیاە و برگ، جای آفتاب نگیر در کوە، نوالە، نان مفت.

## و

وەیشوومە: بەڵا، فتنە، بریێتی لە سەرمای سەخت؛ بلا، فتنە، کنایە از سرما و کولاك سخت.

ورە: درار، زراو، ئازایی؛ زهرە، شجاعت، زمزمەی زیرلبی.

وزە: توانا، تاقەت، گەمە؛ تاب و توان، تحمل، نوعی بازی.

وەباڵ: تاوان، ئۆباڵ؛ وبال.

## ه

هەڵەنگان: هەڵە نگووتن، سەرەنگرێ بوون؛ سکندری خوردن.

هەدا: ئۆقرە، سەکیش، پێکەوە؛ آرام، باهم.

هوڕە: مێشوولەی درشت، تەم و سەمای ناوەخت، لۆکەی پاك، گڕەبا، پشەی مالاریا، سرما و مە غلیظ نابهنگام، پنبەی پاك، بادتند.

هۆمل: بە گژڕا چوونەوە؛ مقابلە.

هەڵز: گیایەکی بە ناو بانگە، قەت، وێنجە؛ گیاهی است، یونجە.

هەنجەمە: شوێنی لێك هەڵپچران، ترازاندن؛ محل شکافتگی و از هم بازشدن.

هاوێز: دمورە، بڵاو، کەسێ کە فڕێ دەدا؛ طرف، سو، پراکندە، انداز.

هەراو: پان و بەرین. گوشاد؛ گشاد.

هەل: دەرفەت؛ فرصت.

هێن: کانی، هێندە؛ چشمە، اندازە.

هەنە: هەڤی، خەنە؛ هوو، حنا.

هەوشین: نەخۆشی شیر وشك کردن، گیایەکە؛ بیماری شیر خشك کردن، گیاە

آویشن.

هەشتات: لەز، پەلە؛ شتاب.

هەگاڵ: مێژەرەی تاتەکان؛ دستار تازی‌ها.

هەتڵە: رمویو، هەڵوەدا، رێ لێ گۆڕاو؛ رمیده، گمراه، منحرف.

## ی

یاو: تاولەرز، ئاو، گەیشتن، یاد، ئەسپ، هێواش، تب، آب، رسیدن، یاد، آهسته، اسب.